کورتە چیرۆک ـ١

# خەزێنەی شاراوە



زەکەریا ئوڵاشڵی

İRFAN
PUBLISHING



# کورتە چیرۆك -١

# خەزێنەی شاراوە

ئامادەکردنی: زەکەریا ئوڵاشڵی
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مارت - ٢٠١٤
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٤٤)ی
ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# ناوەرۆک



# مێرووله

ئەو موسوڵمانانەی کە لە چەندین شوێنی جیاوازی دنیاوە هاتبوون، لە کۆتایی تەواوکردنی فەریزەی حەجدا بوون. حاجییەکان پۆل پۆل دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان. شێرکۆ و ئارام کە دوو هاوڕێی خۆشەویستی یەکتر بوون، بۆ دواجار تەوافی کەعبەیان کرد. شێرکۆ پاش تەواوکردنی نزاکەی هەستایە سەرپێ و تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد، بەڵام چاوی بە ئارامی هاوڕێی نەکەوت. لەناکاو بینی وا هاوڕێکەی لە کەنارێکدا دانیشتووە و بەکوڵ نزادەکات و لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە. بۆیە بەدڵخۆشییەوە بەرەو ڕووی هاوڕێکەی ڕۆیشت و پێی وت:

- دوعات بۆ منیش کرد؟

- تۆ بڵێی بۆم نەکردبێت؟! داواکارم خوای گەورە حەجەکەی لێ قبوڵ کردبین.

شێرکۆ:



- دەی با بڕۆین بۆ شت کڕین، دەبێت بەیانی زوو بگەڕێینەوە.

ئارام بەدڵگرانییەوە ئاوڕی دایەوە بۆ کەعبەی پیرۆز و وتی:

- بەڕاستی دوور کەوتنەوە لێت ئەستەم و گرانە.

شێرکۆ وتی وایە ڕاست دەکەیت هاوڕێی ئازیزم. ئیتر قۆڵی کرد بە قۆڵی ئارامدا و بەناو قەرەباڵغییەکەدا ڕۆیشتن بۆ شت کڕین.



ئارام کەمێك خواردن و هەندێك شت و مەکی بەدیاری کڕی.
ئیتر کاتێك کە خەریك بوو لە بازاڕ کاریان تەواو دەبوو و دەگەڕانەوە،
گوێدرێژەکەی بیرکەوتەوە. ئیتر ئالیك و کای بۆ گوێدرەژەکەشی
کڕی. بەم شێوەیە تا دەمەو ئێوارە سەرجەم ئامادەکارییەکانیان
تەواوکرد و نوستن.

بۆ ڕۆژی دواتر کاروانەکە لە بەرەبەیاندا کەوتەڕێ. دوای بڕینی ڕێیەکی دوور و درێژ، گەیشتنە شوێنێك و بەمەبەستی پشوودان لایاندا. ئارام کەل و پەلەکانی لەپشتی گوێدرێژەکەی کردەوە.

پاشان دەستی کرد بە گوێنییەکەدا بۆ ئەوەی ئالیك بۆ گوێدرێژەکەی دەربهێنێت. لەناکاو هەستی کرد چەند شتێك بەسەر دەستیدا دەڕۆن و سەردەکەون. ئیتر سەری گوێنییەکەی کردەوە و کۆمەڵە مێروولەیەکی بینی. کەمێك وەستا و بە بینینی ئەو مێرووە بەستەزمانانە دۆش داما. ئەوەبوو سەیری مێروولەکانی دەکرد و بیری لەوەدەکردەوە کە چۆن ڕزگاریان بکات. بەمە زۆر دڵگران بوو. دەیوت: "ئەی خوایەگیان ئێستە من چی بکەم؟ باشە ئەمانە چۆن هاتوونەتە ناو ئەم گوێنییەوە. وا دیارە ئەم بەستەزمانانەم لە مەککەوە هێناوە." دواتر گوێدرێژەکەی دەستی کرد بە ئالیك خواردن و خۆیشی ئەو شتومەکانەی کۆکردەوە کە دایگرتبوون.

کاتێك شێرکۆ هاوڕێکەی بەمجۆرە بینی پرسی:

- کاروانەکە پاش دوو کاتژمێری دی بەڕێدەکەوێت، ئیتر ئەم پەلەپەلەت لەچییە؟ یان ئەوەتا زۆر بیری ماڵەوە دەکەیت؟

- نەخێر، لەبیرتە لە بازاڕ ئالیکم بۆ گوێدرێژەکەم کڕی؟

- بەڵێ لە بیرمە.

- مێروولەی تێچووە. دەبێت بیانبەمەوە بۆ شارەکەی خۆیان.

- دەگەڕێیتەوە؟

- بەڵێ.

- هاوڕێی ئازیزم چ پێویست بەوە دەکات ئەو ڕێگە دوور و درێژە بگریتەوە بەر، وەرە لێرە بەرەڵایان بکەو تەواو.

ئارام وتی:

- شتی وا نابێت، ئەو مێرووله داماوانەم لە شارەکەی خۆیان کردووە. با مافیان لەسەرم نەمێنێت. تۆ خەمی منت نەبێت، بەشەویش ناوەستم و هەرچۆنێك بێت پێتان دەگەمەوە.

شێرکۆ نەیتوانی ئارامی هاوڕێی لەم بڕیارەی پاشگەز بکاتەوە. ئیتر دوای ئەوەی گوێدرێژەکەی تێری خوارد، بە ناو بیابانە لمین و گەرمەکەدا بەرەو مەککە کەوتەوە ڕێ.

شێرکۆ ئارامی بەڕێکرد و پێی وت کە ئاگاداری خۆی بێت. پاشان زۆر سوپاسی خوای گەورەشی کرد لەسەر ئەو هاوڕێ باشەی کە پێی بەخشیوە. چونکە ئارام ئامادە بوو ئەو هەموو ڕێگا دوورە ببڕێتەوە و درەنگ بگاتە ماڵەوە، ئەوەش تەنها لەبەر ئازارنەدانی ئەو مێرووله بەستەزمانانە.

# قەرز

ڕۆژێك لە ڕۆژان خەلیفە هارونە ڕەشید، لەپاش نوێژی بەیانی ئەسپەکەی ئامادەکرد و ڕۆیشتە دەرەوەی شار. بەنیاز بوو کەمێك بەناو باخە پڕ جوانییەکانی شاردا بگەڕێت و لە نزیکیشەوە چاوی بە ژیانی خەڵکەکە بکەوێت.

قسەی لەگەڵ زۆربەی ئەو کەسانەدا دەکرد کە لە ڕێگا پێی دەگەیشتن و دەیدواندن. گوێی بۆ کێشەکانیان دەگرت و هەوڵی دەدا بۆیان چارەسەر بکات. هارونە ڕەشید ڕێگەیەکی زۆری بڕی و زۆر لە شار دوور کەوتەوە. لە دەروازەی گوندێکدا لاوێکی بینی کە لە باخێکدا خەریکی کار و فرمان بوو. لاوەکە خەریکی هەڵکەندنی بیری ئاو بوو و بە سیمایدا دیاربوو کە بە ژیانی خۆی قایلە و دڵی خۆشە.

هارونە رەشید لە ئەسپەکەی دابەزی و لە بیرەکە نزیك بووەوە و سڵاوی لە لاوەکە کرد و وتی:

- ماندوو نەبیت.

گەنجەکە دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و تەماشایەکی ڕێبوارەکەی کرد و وتی:

- زۆر سوپاس. خوای گەورە لێت ڕازی بێت.

- دەبینم بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە کار دەکەیت.

لاوەکەش وەك ڕێزێك بۆ ڕێبوارەکە لە بیرەکە هاتە دەرەوە و فەرمووی لێکردە ژوورەوە. پاشان کە بەسەر پلیکانەکاندا چوونە سەرەوە وتی:

- بەڕاستی کارکردن مرۆڤ دڵخۆش دەکات. ئینجا ئەگەر ڕۆزییەکی حەلاڵیشی دەست بکەوێت، ئەوە زیاتر دڵخۆش دەبێت.

هارونە ڕەشید وەلامی گەنجەکەی بەدڵ بوو. بۆیە لێی پرسی:

- باشە بۆچی بیر لێدەدەیت؟

لاوی خاوەن ماڵ گۆزە ئاوەکەی تەنیشتی هەڵگرت و پەرداخێك ئاوی سارد و کەلەتەزێنی پڕکرد و فەرمووی لە میوانەکە کرد. پاشان لە وەلامدا وتی:

- ئەگەر لەماوەی سێ ڕۆژدا بگەم بە ئاو، ئەوا دە پارچە ئاڵتون وەردەگرم. ئیدی بەم پارەیە دەتوانم قەرزەکانم بدەمەوە و هاریکاری کەسێکی تریش بکەم، خۆ ئەگەر کەسێك قەرزیشی پێویست بوو ئەوا دەیدەمێ.

هارونە ڕەشید هیچ لە قسەی لاوەکە تێنەگەیشت. بۆیە داوای لێکرد بۆی ڕوون بکاتەوە.

- ئەو پارەیەی کە بە هەڵکەندنی ئەم بیرە وەریدەگرم دەیکەم بە دوو بەشەوە. نیوەی دەدەم بە دایك و باوکم و نیوەکەی تریشی بۆ خاوخێزانم بەکاردەهێنم. بەهەمان شێوە کە منیش بەساڵدا چووم، ئەو کاتە منداڵەکانم یارمەتی من دەدەنەوە.

- باشە، بەڵام ئایا تۆ قەرزاری دایك و باوکتیت؟

گەنجەکە لە ناخەوە وەلامی دایەوە و وتی:

- ئایا لەم سەر زەوییەدا کەس هەیە قەرزی دایك و باوکی لەسەر

نەبێت؟ ئەوان هەر لە کاتی لەدایك بوونمەوە بەدەورمەوەبوون و بێ گوێدانە شەو و ڕۆژ و سەرما و گەرما، هەرچییەکم ویستبێت بۆیان جێبەجێ کردووم. جگە لەوەش دوای ئەم هەموو ساڵە لە ئەرك و ماندوو بوون لەگەڵمدا، لێم جیانەبوونەوە تاوەکو کارێکم دۆزییەوە. ئیتر چۆن چاکەی ئەوانم لەبیر دەکەم. جا مەبەستم لە دانەوەی قەرزەکانم ئەمانەبوو. هەروەها بۆ منداڵەکانیشمی خەرجدەکەم تاوەکو لە کاتی پیریمدا ئەوانیش جوان هەڵسوکەتم لەگەڵ بکەن. هەر لەبەر ئەمانەیە کە خۆشییەکی زۆر لە کار کردن وەردەگرم.

هارونە ڕەشید:

- باشە، ئەمانە لە کوێوە فێربویت؟

- لە دینەکەمەوە. خوای گەورە دەفەرموێت گوێڕایەڵی دایك و باوکتان بکەن و بە شەفەقەتەوە بۆیان بڕوانن، هەروەها منداڵەکانیشتان پشتگوێ مەخەن.

هارونە ڕەشید مۆڵەتی لە گەنجەکە خواست و سواری ئەسپەکەی بوو و ڕۆیشت. گەنجەکەش دابەزیەوە ناو بیرەکە. پاشان هارونە ڕەشید بە دڵخۆشییەوە گەیشتە شار و لەبەر خۆیەوە دەیوت "هەتاکو کۆمەڵە کەسانێکی لەم جۆرە لە وڵاتدا هەبن، ئەوا میللەت ناخۆشی بەخۆیەوە نابینێت و بە خۆشی و شادی دەژی."

# گراس

جارێکیان پاشای وڵات لەبەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیدا دانیشتبوو و تەماشای دەریای دەکرد. لە کەنار دەریای پشت باخچە پڕ تەقاڵەکانەوە خێزانێکی بینی یارییان لەگەڵ منداڵەکانیان دەکرد. پاشا هێندە لەو دیمەنەدا ڕۆچووبوو تەنانەت ئاگای لە هاتنە ژوورەوەی خزمەتکارەکەی نەبوو.

دواتر خزمەتکارەکەی کەمێکی تر لێی نزیك بووەوە و وتی:

- گەورەم خواردن ئامادەیە.

پاشا ئاوڕی دایەوە. خەم و پەژارەیەکی زۆر بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. ئیتر بەهێواشی و لەسەرخۆ بەرەو ژووری نانخواردن بەڕێکەوت. کە ڕۆیشتە ژوورەوە هەموو وەزیرەکان لەبەری هەستانەوە. پاشا بەر لەوەی دابنیشێت کەمێك تەماشای ئەو خواردنانەی کرد کە سەرمێزەکەیان پێ ڕازێندرابووەوە.

دواتر، فەرمووی لێکردن و پێی وتن کە دەست بکەن بە نان خواردن.

ئینجا خزمەتکارێك هاتە لای پاشا و ناوی بیست جۆر شۆربای بۆ ژمارد. پاشا ڕووی گرژبوو و ئارەزووی خواردنی نەبوو. بۆیە خۆی هیچی بەدڵ نەبوو و سەرۆکی چێشتلێنەرەکانی سەرپشك کرد لەوەی بەدڵی خۆی شۆربایەکی بۆ دابنێت.

دیاربوو کە ئەوە چەندین مانگە پاشا گیرۆدەی کێشەیەکە، بەڵام

جگە لە سەرۆك وەزیران لای کەس نەیدرکاندبوو. بۆ ڕۆژێکیش چییە لەو ماوەیەدا ڕوخساری پاشا پێکەنینی بەخۆیەوە نەبینی بوو. بۆ خۆی خەمبار خەمبار بە کۆشکەکەیدا دەهات و دەچوو. ئەردەڵانی سەرۆك وەزیران بە پاشای وت:

- پاشام ئەمڕۆ تەندروستیت چۆنە؟ دەرمان و ڕێنماییەکانی پزیشکەکەی پێشوو کاریگەرییان هەبوو؟

وەزیر ئەمانەی پرسی، بەڵام پاشا بە ڕوخساریدا دیاربوو کە سوودی لە دەرمانەکان نەبینی بوو. چونکە دەم و چاوی تەواو لاواز ببوو و زەرد هەڵگەڕابوو. ئەمەندە بێزاربوو شەڕی لەگەڵ سێبەرەکەی خۆیشیدا دەکرد.

پاشا کەوچکەکەی برد بۆشۆرباکە و بەرلەوەی بیبات بۆ دەمی بە وەزیری وت:

- ئەمساڵ ئاوی ڕووبار و دەریاچەکان کەمی کردووە، تۆ بڵێی ئەمساڵ وشکە ساڵی بێت؟

- نەخێر گەورەم.

- باشە ئەی لە عەمباری کۆشکدا دانەوێڵەی پێویست هەیە؟

- دڵگران مەبن گەورەم، عەمبارەکانمان پڕن.

پاشا پێش ئەوەی دەست بکات بە نانخواردن ئەو کۆمەڵە پرسیارەی کە چەندین ڕۆژ بوو مێشکی پییانەوە سەرقاڵ ببوو لە ئەردەڵانی سەرۆك وەزیرانی پرسی.

هەموو وەڵامەکانیش ئەرێنی بوون، بەڵام دڵتەنگییەکەی نەڕەوییەوە بۆیە وتی:

- هێشتا هەر چێژ لە خواردن نابینم، باشە تاکەی من ئاوا بە

دڵگرانی دەمێنمەوە؟

سەرۆك وەزیران پاش کەمێك بیرکردنەوە وتی:

- پاشام من کەسێکی زانا دەناسم. با بنێرم بەدوایدا بێت بۆ ئێرە، بە دڵنیاییەوە چارەیەکت بۆ دەدۆزێتەوە.

پاشان ناردیان بەدوایدا و بۆ ڕۆژی دواتر پیاوە زاناکە لە کاتی چێشتەنگاودا هاتە لای پاشا و دوایُ ئەوەی بە جوانی گوێی بۆ کێشەکانی گرت، پێی وت:

- پاشام سوپاس بۆ خوا تەندروستیتان لە جێی خۆیەتی. با بێینە سەر چارەسەری دڵتەنگییەکەتان. من دەڵێم ئەگەر کراسی یەکێك لەبەر بکەن کە هیچ دڵگرانییەکی نەبێت ئەوا ئێوەش لە دڵگرانییەکەتان ڕزگارتان دەبێت. ئینجا پیاوی زانا و دنیادیدە هیوای تەندورستییەکی باشی بۆ پاشا خواست و کۆشکی بەجێهێشت.

پاشا دەم و چاوی گەشایەوە. چونکە لە کۆتاییدا دەرمانی نەخۆشییەکەی دۆزییەوە. چارەسەرەکەش هەتا بڵێی ئاسان بوو، چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە بەئاسانی کراسی کەسێکی بێخەمی دەست دەکەوێت. پاشا تەماشایەکی ئەردەڵانی سەرۆك وەزیرانی کرد و وتی:

- ئادەی سەرۆك وەزیران، ئەگەر تۆ هیچ کێشەیەکت نییە و خەمبار نیت، ئەو کراسەتم بدەرێ با لەم هەموو دەرد و مەینەتییە ڕزگارم بێت.

سەرۆك وەزیران لەبەردەم ئەم داواکارییەی پاشادا سەری داخست و بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو. پاشان کەوتە باسکردنی کێشەکانی خۆی بۆ پاشا، کە چۆن خێزانەکەی توشی نەخۆشی بووە و کوڕەکەشی

ڕۆیشتووە و ماڵی جێهێشتووە. پاشاش بەجوانی گوێی بۆ سەرۆک وەزیرانە خۆشەویستەکەی ڕاگرتبوو. پاشان پێی وت:

- ئەردەڵان منیش وامدەزانی تۆ هیچ کێشە و دەردێکت نیە. ئەم هەموو دەرد و ناخۆشییانە چییە توشت بووە؟!

وەزیر سەری داخست و بێدەنگ بوو. دیسان پاشا وتی:

- ئەردەڵان کەواتە خۆت ئامادە بکە. با بە یەکەوە بەناو شاردا بگەڕێین و کەسێکی بێ خەم بدۆزینەوە و لەم دەردە ڕزگارمان ببێت.

ئیتر ئەوەبوو هەردووکیان پۆشاکی میریی ناو کۆشکیان لابرد و وەکو خەڵکی ئاسایی خۆیان گۆڕی و بێ ئەوەی کەس بیانبینێت لە کۆشك چوونە دەرەوە. تاکو دەمەو ئێوارە بست بە بستی ئەو شارە گەڕان. بەڵام کەسێکی بێخەمی لەو شێوەیەیان دەست نەکەوت. هەر لە گەنجەوە تا پیر لە هەژارەوە تا دەوڵەمەند، هەریەکەو کێشەیەکی هەبوو. کاتێك پاشا چاری نەما و کەسی دەست نەکەوت، کەوتە بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە. تەماشای ڕێگای دەرەوەی شاری کرد. پاشان قۆڵی ئەردەڵانی گرت و وتی:

- نابێت لەم کارەمان پاشگەزبینەوە. با خێرا دوو ئەسپ بکڕین و هەرچی شاخ و دۆڵی ئەم وڵاتەیە بگەڕێین. تۆ بڵێی کەسێکمان دەست نەکەوێت.

ڕۆژی دواتر دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی پلانەکەیان و بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە گەڕاندابوون. دواتر لایاندایە لای ئاشێکی بچووك و شەویان لەوێ بەسەربرد. بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر خاوەن ئاشەکە قاوەڵتییەکی سادەی بۆ ئامادەکردن. هەموو پێکەوە لەسەر خوانەکە دانیشتن. دواتر پاشا هۆکاری هاتنەکەیانی ئاشکرا کرد

و وتی:

- بەدوای کەسێکدا دەگەڕێین کە هیچ خەمێکی نەبێت. ئێوە لەم ناوە کەسی وا شك نابەن؟

خاوەن ئاشەکە پەرداخێك شیری بۆ سەرۆك وەزیران تێکرد و وتی:

- بەڵێ، کەسێکی وا شك دەبەم. شوانی گوندەکەمان کەسێکی زۆر بێ خەم و پەژارەیە.

پاشا خەریك بوو لەخۆشیدا بفڕێت، لەدڵی خۆیدا وتی: "لە کۆتاییدا ئەو کەسەی بەدوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە."

- لەکوێ دەتوانین بیبینین؟

- زۆر دور نییە. بۆخۆی لەو ناوە خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکانیەتی.

پاشا و سەرۆك وەزیران خۆیان ئامادە کرد و کەوتنەڕێ. پاش کەمێك گوێیان لە دەنگی شمشاڵێك بوو. پاشا لە خۆشیاندا خەریك بوو باڵی دەگرت.

- ئەوە شوانەکەی خۆمانە، تەماشا چەند دڵخۆشە، ئەوەتا بۆخۆی شمشاڵ لێدەدا.

ئەردەڵانیش زۆر بەمە دڵ خۆش بوو. چونکە دواجار دەرمانی دەردی پاشایان دۆزییەوە.

ئیتر بەناو دارەکاندا ڕۆیشتن و گەیشتنە دەشتاییەکە و لە ژێر دارگوێزیکدا بە شوانەکە گەیشتن کە خەریکی شمشاڵ ژەنین بوو. کەچی لەناکاو هەردوکیان توشی سەرسوڕمان بوون. چونکە شوانەکە کراسی لەبەردا نەبوو.

لەوکاتەدا پاشا بیری لە دەرمانی دەردەکەی خۆی دەکردەوە و وتی تازە کار لە کار ترازا. چۆن دەبێت ئەم شوانە کراسی لەبەردا نەبێت و دڵ خۆشیش بێت. پاشا بە نائومێدییەوە لە ئەسپەکەی دابەزی و سڵاوی لە شوانەکە کرد و لەپاش کەمێك گفتوگۆکردن، پاشا مەبەستی هاتنەکەیانی بۆ باسکرد و وتی:



- ئێمە هاتبوین کراسەکەت ببەین.

شوانەکە:

-ڕۆژێك لەمەوبەر بهاتنایە دەمدانێ.

سەرۆك وەزیران:



چییە ئایا لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەو شێوەیە چاکە دەکەیت؟

شوانەکە زانی کە بەکەم تەماشای دەکەن، بۆیە خۆی تێك نەداو وتی:

- سوپاس بۆ خوا بژێوی ژیانم بە لەوەڕاندنی ئەم مەڕانە پەیدا دەکەم. زۆر لە ژیانی خۆشم بێ سکاڵام. ئەشێ ماڵ و کێڵگە و مەڕ و ماڵاتی خۆمم نەبێت، بەڵام ئەوە نییە کارێکم هەیە لێی بەرپرسیارم.

- هیچ دەرد و خەمێکت نییە؟

شوانەکە کەمێك تەماشای ڕوخساری سەرۆك وەزیرانی کرد و پێکەنی.

کەس هەیە کێشە و پەژارەی نەبێت؟ کاکەگیان ئێمە لە دنیادا دەژین نەوەك بەهەشت. بەڵام هەوڵدەدەم بە یارمەتیدانی کەسانی تر هەموو خەم و خەفەتەکانم لەبیر بکەم. هیچ کەسێك نییە خەم و خەفەتی نەبێت. من خاوەنی ئەم مەڕانەم. بۆیە لەپێش هەموو شتێکدا پێویستە ئاگام لەمانە بێت. مرۆڤێکیش ئەگەر هیچ دەردێکی نەبێت تامی ئەو خواردنەش ناکات کە دەیخوات گەورەم.

پاشا و سەرۆك وەزیران سەیرێکی یەکتریان کرد و هەردوکیان واقیان وڕما لەوەی کە چۆن شوانەکە توانی بیانناسێتەوە.

سەرۆك وەزیران:

- باشە چۆن ئێمەت ناسییەوە؟

شوانەکە بە زەردەخەنەوە هێمای بۆ پەنجەی پاشا کرد و وتی:

- ڕاستە بەرگ و پۆشاکی پاشایەتیتان گۆڕیوە بەڵام ئەنگوستیلەی پاشایەتیتان لە پەنجەتان لانەبردووە.

پاشا سەیرێکی ئەنگوستیلەکەی کرد کە لە باوکییەوە بۆی مابووەوە. شوانەکەش لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- گەورەم ئەوەندە نابێت هاتوونەتە سەر تەختی پاشایەتی و بوون بە سەرۆکی وڵاتەکەمان. کەچی ئێوە گوێتان لە ئاست خەم و خەفەت و کێشەی ئەو خەڵکەدا کەڕکردووە. دواتریش هەستاون دەستتان کردووە بە گەڕان بەدوای چارەسەری نەخۆشییەکەتاندا. ئایا کەسێکتان دۆزییەوە کە دەردی نەبێت؟

پاشا بەدەم بیرکردنەوە لەو دووساڵەی کە لەسەر تەختی پاشایەتی بەسەری بردبوو وەڵامی دایەوە و وتی:

- بێگومان نەخێر. نەمدۆزییەوە.

- دەی دڵنیابن کە ئێوەش تا ئێستا چارەتان بۆ دەردی کەس نەدۆزیوەتەوە. بەڵام ئەوەتا بۆ چارەسەرکردنی دەردی خۆتان ئەو ڕێیە دوورەتان بڕیوە. ئەگەر پێداویستی خەڵکەکەتان جێبەجێبکەن، ئەوە پێویستان بە کراسەکەی منیش نابێت. ئەوکاتە نەخۆشییەکەشتان هەر لە خۆوە چاك دەبێتەوە.

سەرۆك وەزیرانیش سەری ڕەزامەندی بۆ پاشا لەقاند. پاشا زۆر هەوڵیدا شوانەکە قایل بکات کە هەندێ پارەی لێوەربگرێ، بەڵام شوانەکە بەمە ڕازی نەبوو.

لەو ڕۆژە بەدواوە پاشا لە نزیکەوە بەکێشە و داواکارییەکانی خەڵکی وڵاتەکەیەوە سەرقاڵ بوو و لە ماوەیەکی کەمیشدا لە نەخۆشییەکەی چاك بووەوە و بەدڵخۆشی ڕاستەقینە شادبووەوە.

# قسەی نابەجێ

ڕۆژێکیان پیرێکی ڕیش سپی بەرەو شار دەڕۆیشت. لە ڕێگادا و لەسەر لوتکەی چیاکان کلو کلو بەفر دەباری و ڕەشەبایەکی بەهێزیش لە دەشتەکەدا هەڵی کردبوو. باپیرە سولەیمان بە بینینی ئەو دیمەنانە بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی هاتەوە پێش چاوی و بوخچەکەی لەسەر بەردێك دانا. دواتر مەتارەکەی لە ناو بوخچەکەدا دەرهێنا و چەند قومێك ئاوی خواردەوە. ئینجا دانیشت تێر تەماشای خانووەکانی ئەو دەوروبەرەی کرد کە یەك لەدوای یەك ڕیزیان بەستبوو.

وەرزی زستان و سەرما و سۆڵە بوو. دوکەڵی سۆبای داری خانووەکان بە دەشتەکەدا بڵاو ببووەوە. بەفر بەتەواوی ئەو ناوەی

داپۆشی بوو. لە دوورەوە دەتوت ئەو دەشتە تارای سپی پۆشیوە. باپیرە سولەیمان لەبەر خۆیەوە وتی "با تا درەنگی نەکردووە بگەمە گوندەکە و ئێوارەش لای سامان ئاغا بە میوانی دەمێنمەوە و سبەینێش دەکەومەوە ڕێ."

لەگەڵ تاریك بوونی دنیادا خێرایی بەفرەکەش زیادی کرد. کۆلانەکان چۆڵ و هۆڵ بوون و کەسیان پێوە نەبوو. خەڵکەکە هەر زوو دوکانەکانیان داخستبوو و گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە. باپیرە سولەیمانیش لەگەڵ بانگی ئێوارەدا گەیشتە بەردەم ماڵی سامان ئاغا. خزمەتکاری ماڵی ئاغا دەرگای لە پیاوی بەساڵاچوو کردەوە کە لە سەرماندا دەست و دەم و چاوی مۆر هەڵگەڕابوون.

مام سولەیمان وتی لە دوورەوە هاتووم. هەر بڵێیت سولەیمانی قەرەگۆل، ئاغات خۆی دەمناسێتەوە.

خزمەتکارەکە ڕۆیشتە ژوورەوە و ئەوەندەی پێ نەچوو گەڕایەوە. دواتر فەرمووی لە باپیرە کرد و بردیە ژووری میوان.

پاشان داری خستە ناو ئاگردانەکەوە و وتی:

- زۆر سەرماتان بووە. تا کەمێك گەرمتان دەبێتەوە نانیش ئامادە دەبێت.

ئیتر باپیرە سولەیمان بە ئاوێکی شلەتێن دەست نوێژی گرت و لەو کاتەدا لە یەکێك لە ژوورەکانەوە دەنگی کۆکەیەکی بەرز هات. دیاربوو کە یەکێك نەخۆشە و زۆر بەقورسیش دەکۆکێ.

باپیرە بە خزمەتکارەکەی وت:

- ئەوە کێیە نەخۆشە؟

-گەورەمان نەخۆشە، وا نزیکەی مانگێك دەبێت بەوجۆرە

دەکۆکێت.

باپیرە سولەیمانیش هیوای چاك بوونەوەی بۆ ئاغا خواست و نوێژی شێوانی دابەست.

لە پاش نانی ئێوارە سامان ئاغا و باپیرە سولەیمان و میوانەکانی تر لە ژوورێکی گەورەدا دەستیانکرد بە چا خواردنەوە و دەمەتەقێ. ئاغا ناوە ناوە کۆکەیەکی توندی دەگرت و ناچار وچانێکیان دەدا بە دەمەتەقێکە. سامان ئاغا تەواو هێزی قسەکردنی لێ بڕابوو. کە باپیرە سولەیمان ئاغای خاوەن ماڵی بەم شێوە ناڕەحەتە بینی، خۆی پێ ڕانەگیرا و وتی:

- ئاغام بەڕاستی توشی کۆکەیەکی خراپ بویت. وا بڕوات دڵت دەپسێت. دەی بۆچی هەروا لە شوێنی خۆت دانیشتویت و هیچ شتێك ناکەیت، هێشتا گەنجیت، زۆرت بەبەرەوە ماوە؟

سامان ئاغا دووبارە دوای ئەوەی کۆکەیەکی توند گرتی، بە چاوی پڕ لە ئاوەوە کەوتە قسەکردن.

- جا چی بکەم مامە سولەیمان گیان؟ ڕێگە چارەیەکم بۆ نەدۆزرایەوە. ئوحو، ئوحو...

ئیتر باپیرە سولەیمان بە خۆشی ئەوەی دەوای دەردی ئاغای دۆزیوەتەوە، هەر لەوێدا باسی دەرمانێکی کرد.

- پێشینان ڕاستیان وتووە، ئەو نەخۆشەی چاکبێتەوە پزیشك بەپێی خۆی دێت بۆلای. دەرمانێکم لایە یەکسەر کۆکەکەت ناهێڵێت. ئاغا بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو.

- ئەوە بەڕاستە باپیرە سولەیمان!

باپیرە سولەیمان زۆر باوەڕی بەخۆی بوو، بۆیە بیری لە بەدەست

هێنانی ڕەزامەندی ئاغا دەکردەوە و بە لە خۆبایبوونێکەوە کەوتە قسەکردن.

- بەڵێ زۆر بەڕاستمە.

- هەر بە ڕاستی دەرمانی هەیە؟

باپیرە سولەیمان:

- بێ گومان. لە کەنار دەریایەکی لای ئێمە جۆرە گوڵێك هەیە. ئەگەر ئەو گوڵە لەگەڵ ئاو و هەنگویندا تێکەڵ بکەیت و بیخۆیتەوە یەکسەر کۆکەکەتان نامێنێت. ساڵی پار مُنیش لەو کۆکەیەی ئێوەم گرتبوو. خانم بۆی کوڵانم و خواردمەوە. تا بەیانی چاك بوومەوە.

سامان ئاغا ویستی قسە بکات، بەڵام کۆکەکەی ڕێی نەدا.

باپیرە سولەیمان بەردەوام بوو لەباسکردنی ئەو شتانەی بەسەری هاتبوون. وەکو پزیشکێك یەك بەیەکی ئەو شتانەی باسدەکرد کە پێویست بوو ئاغا بیانکات. لە کۆتایدا کە قسەکانی تەواو بوون، ئاغا بە دەستی ئاماژەی بۆ خزمەتکارەکەی کرد و ئەویش هاتە لای ئاغا و لە خزمەتیدا وەستا.

- هەر ئێستا کاروانێك ئامادەبکەن و بکەونە ڕێ. باپیرە سولەیمان دەچێتە کەنار دەریاکە و گوڵە بەیبون و هەنگوینم بۆ دێنێت.

باپیرە سولەیمان هەرچەندە هەوڵی دا نەیتوانی ئاغا لە بڕیارەکەی پاشگەز بکاتەوە. هەر بەو شەوە کاروان ئامادەکرا و کەوتنە ڕێ. کاتێك کە لە دەروازەی شار ڕۆیشتنە دەرەوە پاسەوانەکان کاروانەکایان وەستاند و لێیان پرسین:

- خێرە ئەوە. بەم سەرما و سولە بۆ کوێ دەڕۆن؟

- مەپرسە کوڕم. دەمی خۆمان پێنەگیرا، وتمان با لای ئاغا خۆمان شیرین بکەین، کەچی وا ئێستا بوین بە قسەی خۆمانەوە و بەرەو کەنار دەریاکە دەڕۆین. تۆش ئاگاداری خۆت بە، زمانی خۆت لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنە. هەرچی دەزانی لە هەموو شوێنێك باسی مەکە. قسەی نابەجێ لە چلەی زستاندا مرۆڤ دەخاتە ڕێ. چی بکەین ئیتر هەڵەیەك بوو کردمان. دەی خوات لەگەڵ ڕێگامان دوورە.

کاروانەکەش بەو نیوە شەوە کەوتە ڕێ و باپیرە سولەیمانیش لە پێشیانەوە دەڕۆیشت و ڕێی پیشان دەدان.

# حەماڵ

له کۆڵانەکانی ناو شارەوە حەماڵێك دەرکەوت. حەماڵەکە باڵایەکی کورتی هەبوو. هەروەها بە هۆی قورسی کۆڵەکەی سەر شانیشییەوە، پشتی کوڕ ببووەوە و تەواو شەکەت و ماندوو ببوو. ئیتر لای دایە سوچێك و دەستەسڕەکەی بەزۆر لە گیرفانی دەرهێنا و ناوچەوانە چرچەکەی پێ سڕی و وچانێکی دا. پاشان دەستەسڕەکەی خستەوە گیرفانی و تەماشایەکی ئەو هەورازەی بەردەمی کرد کە دەبوایە بەسەریدا سەربکەوێت. قۆڵی لێ هەڵماڵی و هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و بەهەموو هێزێکیەوە بە هەورازەکەدا سەرکەوت. کۆڵەکەی تابڵێیت قورس و کەش و هەواش زۆر گەرم بوو. حەماڵەکە لە بیری ئەوەدا بوو کە هەرچی زووترە شت و مەکەکان بگەیەنێتە خاوەنەکەی. چونکە وا بە نیازبوو دوای ئەوەی کە بارەکەی دایە خاوەنەکەی، لا بداتە ژێر سێبەری دارێك و بۆخۆی لێی بحەوێتەوە و نانی نیوەڕۆی لێ بخوات.

هەر ئەوەندەی نیوەی هەورازەکەی بڕی، تەواو هێزی لەبەر بڕا و هەستی بە لەرزینی ئەژنۆکانی کرد. ئەمجارەیان بە پشتە دەستی ئارەقی ناوچەوانی سڕی و هەر بەیەکجاری ماندوو بوو و لە پەلوپۆ کەوت.

لەو کاتەدا دەوڵمەندێك دای بەلایدا و ئەمیش خۆی پێنەگیرا و لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئەی خوایەگیان ئەمە چ کارێکە؟ هەیە لە جێی خۆی ناجوڵێت و پارەی بۆ دێت. کەچی بە هەزار و یەك نارەحەتی ئینجا پاروە نانێك بەم بەندەیەی خۆت دەبەخشیت!

پاشان یەك دوو هەنگاوی تری هەڵهێنا و ئەوەندەی نەبرد لایدایە ژێر دیوارێك.

کۆڵە قورسەکەی سەرشانی دانا و تەواو باری سوك بوو. لە ژێر سێبەری دیوارەکەدا لێی دانیشت و بۆ ماوەیەك لە پیاوە دەڵمەندەکە وردبووەوە. لەم کاتەدا کەوتە بیرکردنەوە لە کارێکی ئاسانتر و دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی "خوایەگیان کارێکم بە نسیب بکەیت کە هەر لە شوێنی خۆمەوە دابنیشم و پارەم بۆ بێت."

کاتێك حەماڵەکە سەری نابوو بە دیوارەکەوە و بەدڵێکی تەنگەوە لە بیرکردنەوەدا بوو، دەنگە دەنگی چەند کەسێك، کە لە کۆلانەکەی ئەودیو بە شەڕهاتبوون بەئاگایان هێنایەوە. حەماڵەکە خۆی پێنەگیرا و ناوبژیوانی کردن. جیاکردنەوەشیان ئەوەندە ئاسان نەبوو. بەڵام ئەوەندەی نەبرد خۆی لە ناوجەرگەی شەڕەکەدا بینیەوە و یەکەمجار مستەکۆڵەیەکیان دا بە دەموچاویدا و تێلایەکیش بەر پشتی کەوت. یەکسەر خوێن بە هەموو گیانیدا هاتە خوارەوە و خەڵتانی خوێن بوو. دەم و چاوی ئاوسا و قاچیشی تەواو ئازاری پێگەیشت.

هەر زوو پۆلیسەکان خۆیان گەیاندە شەڕەکە و حەماڵەکەشیان لەگەڵ ئەواندا دەستبەسەرکرد و بردیانن بۆ بەندیخانە... حەماڵەکە

هەر چەندە هاواری بێتاوانی خۆی دەکرد، بەڵام کەس باوەڕی پێنەکرد. پێیان وت: "دەبێت تا ڕۆژی دادگایی لە بەندینخانە بمێنیتەوە."

ئیتر چاری نەما و ڕۆیشتە سوچێکەوە و کەوتە چاوەڕوانی کردن. سەر لەئێوارەی ئەو ڕۆژە پۆلیسە ئێشکگرەکان ژەمی ئێوارەیان خستە بەردەم حەماڵەکە. ئەویش سەیرێکی نانەکەی بەردەمی خۆی کرد و دۆش داما. هەرچەندە زۆریشی برسی بوو بەڵام دەستی بۆ خواردنەکە نەبرد و هیچی لێ نەخوارد. حەماڵەکە لەناکاو دەستی کرد بە پێکەنین.

زیندانییەکەی تەنیشتی بەم هەڵسوکەوتەی حەماڵەکە زۆر سەری سوڕما.

- ئەوە بەچی پێدەکەنی؟

- کورە هەر مەپرسە. ئەمە بەری ڕەنجی نزای خۆمە دەیخۆم.

پیاوەکە هیچ لەم قسانە تێنەگەیشت.

حەماڵەکە لە قسەکانی بەردەوام بوو:

- برادەر، ئەمڕۆ لە خوای گەورە پاڕامەوە کە لەمەودوا پاڵبدەمەوە و بێئەوەی کار بکەم ڕۆزیم بدات. بەڵام بیرم چوو بڵێم خوایە ئەوەی خێری تێدایە ئەوەم بە نسیب بکەیت. ئا بەوە پێدەکەنم. وا ئێستە خواردن هاتووەتە بەردەمم بەڵام هەرچییەکەم ناتوانم بە ئاسوودەیی و دڵخۆشییەوە بیخۆم. دەبوایە داوای کارێکی پڕ خێرم لە خوای گەورە بکردایە، چ جای ئەگەر زەحمەتیش بێت.

# سەفەری حەج

ڕۆژێکیان مێرووڵەیەکی ئێسك سووك و خنجیلانە لە نێو گوڵ و گوڵزار و گژوگیا ڕەنگاوڕەنگەکانی بەهارەوە سەری دەرهێنا و تەماشایەکی ئاسمانی کرد. مێرووڵەکە شەلە شەل دەڕۆیشت و خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا. ڕوخساری ماندوویێتییەکی زۆری پێوە دیاربوو. ئەوەبوو دەستێکی گرت بە ناوچەوانییەوە و تەماشایەکی ڕێگا دوور و درێژەکەی بەردەمی کرد. هەر بەچاو ڕێگاکەی پێوا و بڕیارێدا لە سەفەری حەجەکەی بەردەوام بێت. ڕێك لەو کاتەدا مشکەکوێرەیەکی لێ پەیدابوو.

- ئەوە خێرە مێرووڵەی هاوڕێم، بەرەو کوێ؟

مێرووڵەکە هەروەك بڵێی گوێبیستی پرسیاری مشکەکوێرەکە نەبووبێت، تەماشایەکی ڕێگاکەی خۆی کرد و بەردەوام بوو. مشکەکە هەستی کرد مێرووڵەکە خەیاڵی ڕۆیشتووە، بۆیە دووبارە پرسیاری کردەوە.

ئەمجارەیان مێرووولەکە بە دەنگێکی ناسکەوە وتی:

- دەچم بۆ حەج، بۆ مەککە.

مشکە لە ناکاو کشایە دواوە و بە سەرسوڕماوییەوە بۆ مشکەکەی ڕوانی و ئەم وتانەی لە زار هاتە دەر:

- حەجی چی؟ ئەرێ مێرووولەی برام خۆ شێت نەبویت؟

مێرووولەکە ئاوڕی دایەوە بۆ مشکەکوێرەکە و بەبزەیەکەوە وتی:

- دەڕۆم بۆ حەج. جا ئەمە چی تێدایە، بۆ وا حەپەساویت؟

کە مشکەکە تێگەیشت ناتوانێت مێرووولەکە لە بڕیارەکەی پاشگەز بکاتەوە، پێی وت:

- کورە بەم قاچە شەلەتەوە ناتوانیت هەتا ئا ئەو گردەی ئەوبەریش بڕۆیت. ئیتر چۆن دەتوانیت بگەیتە ئەو مەککەیەی کە تەنانەت مرۆڤەکانیش بە چەندین مانگە ڕێ دەیگەنێ؟!

مێرووولەکە سەری داخست و بە دەنگێکی پڕ متمانەوە وتی:

- مشکی برام دەزانم. بەڵام خۆ ئەگەر بێت و نەشگەمە ئەوێ، ئەوا لە ڕێگەی حەجدا دەمرم.

مشکەکە زۆر دڵی بە مێرووولەی هاوڕێی سووتا و ویستی هەرچۆنێك بێت یارمەتی بدات. بۆیە پێی وت:

- من هەرخۆم بەتەمای ئەو لادێیەی پشتی گردەکە بووم. ئەگەر دەتەوێت دەتوانم تا ئەوێ لەگەڵ خۆمدا بتبەم و ئێوارەش دەبێت لای خۆمان میوان بیت. بەیانیش زوو لەگەڵ مەلا بانگداندا یەکسەر بکەوەرە ڕێ.

مێرووولەکە لە خۆشیدا دەم و چاوی گەشایەوە و تۆزێ هێزی

بەبەردا هاتەوە و لە مشکەکەی پرسی:

- ئەوە بەڕاستە؟

- بەڵێ، خێرا خۆت هەڵدەرە سەر پشتم. با لە پێشدا بگەینە لادێکە. کاکە با ئێمەش خێرێکمان دەست بکەوێت. ئیتر هەردوکیان بەرەو لادێکە کەوتنە ڕێ.

مێرووەلەکە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە هەر لە سەرەتای ڕێگاوە ئاوا خوای گەورە یارمەتیدەرێکی بۆ نارد. لەو کاتەدا کە هەردوکیان بە کەناری ڕێگاکەدا بەرەو لادێکە کەوتبوونە ڕێ، هەوایەکی فێنك هەڵی کرد و دیمەنی جوانی ئەوناوە زیاتر دڵخۆشی کردن.

جا لەبەر ئەوەی مێرووەلەکە نییەتی گەورەو و پاك بوو، ئەوا خوای گەورەش دەستبەجێ لەڕێی مشکەکوێرەوە یارمەتی خۆی گەیاندێ.

# هەژار و دەوڵەمەند

لاوە هەژارەکە دوو ڕۆژ بوو بەبرسێتی دەگەڕا و تامی هیچی نەکردبوو. کون بە کونی شار گەڕابوو بەدوای کاردا، بەڵام کەس کاری نەدابوویە. لە تاو برسێتی و لە بێ چارەییدا دای لە دەرگای ماڵێکی دەوڵەمەند. کە دەرگایان لێکردەوە بە خزمەتکاری ماڵە دەوڵەمەندەکەی وت:

- لەبەر خاتری خوای گەورە شتێکم بدەنێ بیخۆم. زۆر زۆرم برسییە.

خزمەتکارەکە کەمێك وەستا و تەماشای ئەم هەژارە نامۆیەی کرد. لەوکاتەدا دەنگی پێی خاوەن ماڵی بەرگوێ کەوت کە بە ڕاکردن بەسەر پلیکانەکاندا دەهاتە خوارەوە. ئیتر هاتە بەردەرگا و بە تووڕەییەوە بە ڕووی هەژارەکەدا هەڵشاخی وتی:

- بڕۆ دەرەوە لە ماڵەکەم. چەند کەسی وەکو تۆم بینیوە! تۆ تەماشا! ئا بەمەش دەڵێن گەنج. بڕۆ لە بازاڕ کار بکە و سکی خۆت تێربکە. شەرم ناتگرێت وا بەم تەمەنەتەوە سواڵ دەکەیت؟

لاوەکە بەم قسانەی خاوەن ماڵەکە نە برسێتی لەبیرما و نەهەژاری، بۆیە سەری دانەواند و وتی:

- بەڕاستی تۆ لە حاڵی مرۆڤەکان تێناگەیت. پێم سەیرە چۆن بە پیاوە دەوڵەمەندەکەی شار ناوبانگت دەرکردووە.

خاوەن ماڵەکە تەواو بەم قسانە تووڕەبوو. خزمەتکارەکەش بۆخۆی لە لایەکەوە وەستابوو و بە بێدەنگی تەماشای دەکردن. خاوەن ماڵەکە لە پشتەوە پاڵێکی نا بە گەنجەکەوە و خستییە سەر زەوی.

- ملت بشکێنە، بڕۆ دەرەوە لە ماڵەکەم!

ئەمانەی ڕوویاندا دڵی گەنجەکەیان تەواو شکاند و زویریان کرد.

ئیتر بەڕوو زەردییەکەوە بە خاوەن ماڵەکەی وت:

- لەخۆت بایی مەبە. نە هەژاری و نە دەوڵەمەندی تا سەر بۆ کەس نامێنن. ئایا هەرگیز بیرت لەوە نەکردووەتەوە کە ڕۆژێك بێت هەرچی سەروەت و سامانت هەیە لە دەستی بدەیت؟

لەسەر ئەم قسانەی گەنجەکە، دەوڵەمەندی بێ بەزەیی، تەواو ئارامی لێبڕا و لە شیرازەی خۆی دەرچوو. ئینجا قۆڵی خزمەتکارەکەی خۆی گرت و پاڵی پێوەنا بۆلای گەنجەکە و بە ڕق و قینێکی زۆرەوە فەرمانی پێکرد و وتی:

- ئەوە دەرکە لەبەر چاوم، نامەوێت جارێکی تر لەم ناوە بیبینمەوە. دواتر بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوتە سەرەوە و ڕۆیشتەوە ژوورەکەی خۆی.

خزمەتکارەکە بە هێواشی لە گەنجەکە نزیك بووەوە و قۆڵی گرت و بەرزی کردەوە و پێی وت:

- تۆ گوێ لەم مەگرە. لەو سەری شار نانەواچییەکی لێیە. زۆر مەردە، هەم ئیشت دەداتێ و هەم سکیشت تێر دەکات.

گەنجەکە هەستایە سەرپێ، خۆی کۆکردەوە و لە بەرچاو دیارنەما.

دوو ساڵی نەبرد ئیش و کاری کابرای دەوڵەمەند بەرەو خراپی ڕۆیشت. هەرچی سەروەت و سامانی هەبوو داینا، بەڵام نەیتوانی بەر لە تێکچوونی کارەکانی بگرێت. بەیانییەکیان ئەو خزمەتکارەی کە چەندین ساڵ بوو لەلای کاری دەکرد، بەڕوویدا وەستایەوە و پێی وت:

- من ئیتر لای تۆ کار ناکەم. ئەوە چەندین مانگە کرێم نادەیتێ. هەر کە ئەمانەی وت، پیاوە دەوڵەمەندە بێ بەزەییەکە بێ سێ و دوو دەری کردە دەرەوە.

خزمەتکارەکەش چوو لای نانەواچییەکی مەردی شارەکە کە تازە دوکانی دانابوو دەستی کرد بە کارکردن. نانەواچییەکە بەرامبەر بە هەژاران کەسێکی زۆر چاك و دڵپاك و مەرد و بە بەزەیی بوو. ئەوەی بهاتایەتە بەر دەرگاکەی دەستی نەدەنا بەڕوویەوە و سکی تێر دەکرد. دواتریش کەمێك پارەی دەدایە، ئینجا بەڕێی دەکرد. بەم جۆرە هەر کەسێك بهاتایەتە لای دوعای خێریان بۆ دەکرد.

کاتێك ڕۆژان بەم جۆرە تێپەڕی ئێوارەیەکیان هەژارێك لەدەرگای ماڵی ئەم دەوڵەمەندە بەبەزەیی و مەردەی دا. هەژارەکە حاڵی زۆر پەرێشان بوو. بەدەم و چاویدا دیار بوو کە چەندین ڕۆژە بە سکی برسی دەسوڕێتەوە. خاوەن ماڵە بەبەزەییەکە خێرا بانگی خزمەتکارەکەی کرد و پیاوە هەژارەکەی پیشاندا و پێی وت:

- تێر خواردنی بدەرێ و دواتر بیبەرە گەرماوەکە جوان بیشۆ و جلی تازەی لەبەر بکە. کە ڕۆیشتیش کەمێك پارە بخەرە گیرفانییەوە.

خزمەتکارەکە یەکە یەکەی ئەو شتانەی پێی وترابوو جێبەجێی کرد. بەڵام کاتێك هەژارەکەی بردە گەرماو و جلی تازەی لەبەر کرد

ناسییەوە. ئەمە ئەو پیاوە دەوڵەمەندە بێبەزەییە بوو کە چەند ساڵێك لەمەوبەر زۆر بێوەفایانە لە ماڵەکەی دەری کرد. بێ ئەوەی گەورە کۆنەکەی پێی بزانێت بڕێك پارەشی کردە گیرفانییەوە و بەڕێی کرد. دواتر بەڕاکردن ڕۆیشت بۆ لای گەورەکەی و پێێ وت:

- دەزانی ئەو هەژارە کێ بوو؟

- نەخێر نازانم، کێ بوو؟

گەورەکەی پێشووم بوو کە چەندین ساڵ لە لای کارم کرد. ئەوەتا هەموو سەروەت و سامانەکەی لەدەست داوە و کەوتووەتە سواڵکردن.

دەوڵەمەندە بەبەزەییەکە یەکسەر ئەو ڕووداوەی چەندین ساڵ بەر لە ئێستە ڕووی دابوو وەکو فلیمێك هاتەوە پێش چاوی و ئاهێکی هەڵکێشا و وتی:

- ڕۆژێکیان لە ماڵەکەی خۆی دەریکردم. پێی وتم کار بکەم و سکی خۆم تێر بکەم. خۆی زۆر بە گەورە دەزانی. تۆ تەماشای حیکمەتی خوا بکە، وا ئێستا ئەو هەژارە و هانای بۆ ماڵەکەی من هێناوە. نابێت کەس بە سەروەتەکەیەوە بنازێت و متمانەی پێی بێت و شەرم لە هەژاری بکات. پێویستە مرۆڤ لە ڕێگای حەلاڵەوە پارە پەیدا بکات. ئەوەی خوای گەورە خۆی بیەوێت ئەوا لە خەزێنە نەبڕاوەکەی خۆیەوە پێی دەبەخشێت. هەروەها دەبێت ئەو سەروەت و سامانەی پێمان بەخشراوە لە ڕێگای خوای گەورەدا بەکاری بهێنین.

# گەشت

بەیانییەك زوو لەگەڵ قوقە قوقی کەڵەشێرەکاندا کەسێك لەماڵ چووە دەرەوە. بەناو کۆڵانەکەدا ڕۆیشت تا لەبەر چاو دیارنەما. ئەمە ئازاد بوو، ئاسنگەری لادێکە. وا بەنیاز بوو پێش ئەوەی دنیا گەرم دابێت، بگاتە بازاڕی شارۆچکەکە و پاش تەواوبوونی کڕین و فرۆشتنەکەی بگەڕێتەوە بۆ لادێکەی خۆیان.

ڕێگای شارۆچکەکە بەناو دەشتێکی کاکی بەکاکیدا تێدەپەڕی و دیمەنێکی جوانی بەخشی بوو بەوناوە. کە بانگی بەیانی دا، ئازاد لە ڕێگادابوو بەرەو شارۆچکەکە. لەوکاتەدا کە ویستی کۆڵەکەی سەرپشتی دابگرێت، قاچی لە بەردێك هەڵکەوت و خەریك بوو بکەوێت. ئیتر بە زۆر خۆی گرتەوە و وتی:

- دەك شەیتان بە...

قسەکەی تەواوی نەکرد و لەبەینی درەختەکانەوە تارماییەکی لێ پەیدابوو. ئازاد تارماییەکەی نەناسییەوە. بەڵام وەختێك تارماییەکە هاتە پێشەوە بینی وا پیرێکی سەرو شەست ساڵانە.

پیرە پیاوەکە زیاتر نزیك بووەوە و پرسی:

- کوڕم ئەوە بەم بەیانیە زووە بۆ کوێ دەڕۆیت؟

- بۆ بازاڕی شارۆچکەکە.

- دەکرێت پێکەوە بڕۆین؟

ئازاد، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا لە بێتاقەتی و تەنیایی ڕزگاری بێت، داواکارییەکەی مامە پیرەی قبوڵ کرد. ئیتر پێکەوە کەوتنە ڕێ. دەمەو نیوەڕۆ لە نزیکی گوندێك لایاندا. ئازاد کەلوپەلەکانی لە ژێر سێبەری درەختێکدا دانا و تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد و بە مامە پیرەکەی وت:

- تۆ کەمێك لێرە چاوەڕێکە، من تا ئەو ڕەزە دەڕۆم و ئێستە دەگەڕێمەوە. ڕەزەکەش دیوارێکی بەردینی نزمی هەبوو، ئازاد لەوێوە خۆی هەڵدایە ناو باخەکەوە.

دووبارە تەماشایەکی چواردەوری خۆی کردەوە و بە پیرە پیاوەی وت:

- ئەگەر هەرکەس هات خێرا ئاگادارم بکەرەوە با نەگیرێین.

ئیتر کاتێك مامە پیرە بەمەبەستی حەوانەوە پاڵی دایەوە بە دارێکەوە، ئازاد چەند هێشووە ترێیەکی بۆ درێژکرد و پێی وت:

- هۆ مامە پیرە، هەستە ئەو ترێیانە بشۆرەوە. تورەکەکەشم نانی تێدایە. ئەوە من دەچم کەمێك ترێی تر لێدەکەمەوە.

ئازاد پەلی مێوێکی نزیك خۆیی ڕاکێشا و هەموو هێشووەکانی لێکردەوە. بەڵکو بەوەشەوە نەوەستا و پەلە مێوەکەی تەواو شکاندەوە. جارێکی تریش گەڕایەوە و ئەوەندەی تری لێکردەوە و دواتر هات هەرچی لق و پۆپی مێوەکان بوو هەمووی شکاندەوە و زیانی پێگەیاندن. مامە پیرە بۆخۆی تەماشای ئەمانەی کرد و تەواو سەری لەم کارەی ئازاد سوڕما.

- بەڕاستی بەداخەوە زیانی زۆرت بە مێوەکان گەیاند.

ئازاد ئەو پەلە مێوانەی بە دەستییەوە گرتبوون بە ڕق و قینێکەوە فڕێی دان و وتی:

- کورە هەر گوێشی مەیەرێ! خۆ ڕەزی من نییە، با خاوەنەکەی بیر لە زیانەکانی بکاتەوە.

کاتێك خەریکی نان و ترێ خواردن بوون، بانگی نیوەڕۆی فەرموو. پیرەکەش بە لاچاو تەماشای ئازادی کرد و بەپەرۆش بوو بزانێت ئایا ئازاد نوێژ دەکات یان نا.

بەڵام دەتوت ئازاد هەر گوێی لە بانگیش نەبووە، بۆیە پیاوە بەتەمەنەکە پێی وت:

- بانگی فەرمووو.

ئازاد پاروەکەی دەمی قوتدا و دەموچاوی پێکدادا.

ئیتر بە شێوازێکی گاڵتە ئامێزەوە بە مامە پیرەی وت:

- جا با بانگبێت، خۆ من نوێژناکەم! پاشان پارچەیەکی گەورەی لە نانەکە کردەوە و خستیە دەمیەوە و بە پێکەنینەوە جوی.

پیرە پیاوەکە لە ناکاو هەستایە سەر پێ. ئازاد هۆکاری ئەمەی نەزانی.

پیرە پیاو ڕوی کردە ئازاد و وتی:

- ببورە براکەم. من ناتوانم چیدی لەم گەشتەتدا هاوڕێت بم.

ئازاد هەر ئەوەندەی ئەم قسەیەی بیست، بەخێرایی پارووەکەی دەمی قوتدا و وتی:

- باشە، بەڵام خۆ من هیچ شتێکی خراپم بەرامبەر نەکردویت؟

- زۆر سوپاس، هیچ کەمتەرخەمییەکت بەرامبەر من نەنواندووە،

بەڵام کەمتەرخەمی زۆرت بەرامبەر خوای گەورە نواند.

ئەم قسانە کاریان کردە سەر ئازاد و وتی:

- باشە چ کەمتەرخەمییەکم نواندووە؟

- لە بەیانییەوە وشەیەکت نەوتووە جێی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت. هەر کە لێرەش لاماندا ڕۆشتیتە ناو ئەو ڕەزەوە وماڵی کەسێکت دزی. تەنها بە دزیکردنەوە نەوەستایت، بەڵکو زیانت بە مێوەکانیش گەیاند. دواتر کە بانگی نیوەڕۆشی دا دیسان نوێژت نەکرد.

ئازاد بەم قسانە زۆر بێزار بوو. بۆیە وتی:

- باشە خۆ تۆش لەو ترێیانەت خوارد کە من دزیبووم و بانگیشی دا و تۆش نوێژت نەکرد. ئیتر تۆ چیت داوە لە من؟

پیرە پیاوەش پێکەنینێکی ترسناکی بە ڕوودا نواند و ئازاد ڕۆحی کەوتە مشتی.

ئازاد بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە گوێی لە پیرە پیاو گرت و ئەویش بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی:

- من نوێژ ناکەم چونکە من شەیتانم و هاتومەتە سەر شێوەی مرۆڤ.

بۆ ئەوە بوومە هاوەڵت تا لە ڕێت دەربکەم. من تەنها لەبەر ئەوەی یەکجار لە فەرمانی خوا دەرچووم، لەلای خۆی دەری کردم. بەڵام بینیم تۆ لە من خراپتریت. باشتر وایە خۆم لەگەڵ یەکێکی تر خەریك بکەم، دەی ماڵئاوا.

ئازاد بە سەرسوڕمانەوە وەستابوو و تەماشای ڕۆشتنی شەیتانی دەکرد. تەنانەت شەیتانیش نەیتوانی هاوڕێیەتی بکات و بەجێیهێشت.

ئیتر پاش کەمێکی تر هاتەوە سەر خۆی و ویژدانی زۆر ئازاری دا. کەوتە بیرکردنەوە لەو شتانەی کە ئەو ڕۆژە ئەنجامی دابوون. بەڕاستی کارەکانی جێی دڵخۆشی و دەست خۆشی شەیتان بوو.

بۆیە بڕیاریدا تەوبە بکات و ببێتەوە بە کەسێکی باش. ترێکانی دانا و ڕۆیشتە نزیك چەمەکە و دەستنوێژێکی جوانی لێ هەڵگرت و بە ناخێکی پڕ لە پەشیمانییەوە ڕووی کردە پەروەردگار و نوێژەکەی دابەست.

# دزی

نەوزاد چەند بلۆکێکی هەڵگرتبوو. دەبوایە یەك یەك لەسەر دیوارەکە دایان بنێت. پاش ئەوەی لە کارەکەی تەواو بوو و هێزێکی هاتەوە بەبەردا، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و ڕۆیشتە ژێر سێبەری درەختێکەوە و پاڵی دایەوە. وەستا نەوزاد لە بەیانی زووەوە خەریکی نۆژەنکردنەوەی پەرژینی باخیماڵێکی دوڵەمەند بوو. هەتا بڵێی ماندوو ببوو، بەڵام ئەوەی بەلای وەستاوە گرنگ بوو زوو تەواوکردنی کارەکەی بوو بەر لە ئێوارە.

لە گۆزەکە کەمێك ئاوی ساردی خواردەوە و تەماشایەکی خانووە دوو قاتەکەی خاوەن ماڵەکەی کرد. بینی وا لە دووریشەوە چەند ڕانە مەڕ و بزنێك بۆخۆیان لەو دەشتەدا دەلەوەڕێن. لە کێڵگەکەشدا بە دەیان کەس کاریان دەکرد. بەڕاستی ئاغا کەسێکی دەوڵەمەند بوو. وەستا نەوزاد زۆر نەوەستا و گەڕایەوە سەر کارەکەی خۆی. ئیتر بەر لە ئێوارە لە کارەکەی بووەوە. بۆ وەرگرتنی کرێی ئەو ڕۆژەی چووە بەردەم دەرگای خانووە دوو قاتەکە، بەڵام خزمەتکارەکە نەیهێشت بچێتە ژوورەوە.

وەستا نەوزاد:

- برۆ بە گەورەکەت بڵێ هاتوم کرێکەم وەربگرم.

بەڵام هەرچییەکی کرد کرێکەیان نەدایە. ئیتر بە ناچاری و بێ ئەوەی عانەیەك وەربگرێت لە ماڵی ئاغا دوور کەوتەوە. ئێوارە داهات و دنیا تاریکی کرد، وەستا ئازادیش لە کەناری رووبارەکەوە تێدەپەڕی، کەچی لەناکاو گوێی لە دەنگی زەنگۆڵەی مەڕ و بزنەکان بوو. ئەویش یەکسەر ڕێڕەوی خۆی گۆڕی و لەناو گژوگیاکاندا خۆی حەشاردا. بینی وا کەمێك لەولاترەوە کۆمەڵێك مەڕ و بزن بێ شوانن و بۆخۆیان دەلەوەڕێن. ئیتر بیری کردەوە و وتی: "مادەم حەق دەستەکەمی نەدامێ، ئەوا منیش دەچم دوو مەڕ دەبەم بۆ خۆم."

تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد و بەرەو ڕووی مەڕ و بزنەکان ڕۆیشت. کە چووە ئەوێ مەڕێکی دابەستەی گرت. پاشان ئەوەندەی نەمابوو لە ڕانەکە دوورکەوێتەوە، دوو سەگی زل و زەبەلاح لەبەردەمیدا قوت بوونەوە. نەوزاد لە ترسا نەیدەوێرا لە شوێنی خۆی بجوڵێ. شوانەکانیش دەستبەجێ گەیشتنە سەری و تا بەیانی لە شوێنێکدا بەندیان کرد و بۆ ڕۆژی دواتر هێنایانە بەردەم دادوەر.

دادوەر لێی پرسی و وتی:

- بۆچی ئەم دزییەت کردووە؟

- ئەو پرسیارە لەو پیاوەی بەرامبەرم بکەن. هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە کاری پێکردم. من لەوەوە فێری دزی بووم.

دادوەر بەم وەڵامە زۆر سەری سوڕما و هیچ لە قسەکانی نەوزاد تێنەگەیشت.

نەوزاد بەردەوام بوو لەسەر داکۆکی کردن لە خۆی و ڕوون

کردنەوەی بابەتەکە...

- هەستام دیواری ئەم پیاوەم نۆژەن کردەوە. لای نزیکی ئێوارەوە داوای کرێکەم لێکرد و نەیدامێ. منیش ویستم دوو لە مەڕەکانی بدزم و بەمجۆرە مافی خۆم وەربگرم.

دادوەر دوای ئەوەی گوێی بۆ تەواوی قسەکانی نەوزاد گرت پێی وت:

ناکرێت دزی لە کەسێك بکرێتەوە لەبری ئەوەی ئەویش دزی لێکردوویت. ئەمە بە کارێکی دروست دانانرێت. ئێستا دوو کێشە لە ئارادایە، یەکەمیان دزییەکەی تۆیە و ئەوەی تریشیان ئەو دزییەیە کە بەهۆی پێنەدانی مافی تۆوە کراوە.

پاشان دادوەرەکە ڕووی کردە دەوڵمەندەکە و پێی وت:

- هەروەك چۆن بردنی ماڵی یەکێك بە دزی دادەنرێت، ئاوا بە هەمان شێوە خواردنی مافی کەسێکیش کە لەلات کاری کردووە هەر بە دزی دادەنرێت. هەر ئێستە پێك بێن و گەردنی یەکتری ئازاد بکەن، ئەگینا ناچار دەبم هەردووکتان بخەمە زیندانەوە.

دادوەر بە دانایی خۆی کێشەکەی بۆ چارەسەرکردن. دەوڵەمەندەکە مافەکەی بۆ وەستا نەوزاد گەڕاندەوە و نەوزادیش داوای لێبوردنی لێ کرد. ئینجا پێش ئەوەی دادگا بەجێ بهێڵن، هەردوکیان لەبەردەم دادوەردا گەردن ئازادیان لەیەکتر کرد و هەریەکەو چوو بەلای کاری خۆیەوە.

# ژیری

لە دێر زەماندا کەسێکی هەژار کە لە تاو گەرمای بەتینی هاوین چین چین ئارەقی دەرکردبوو، لە شارۆچکەکە چووە دەرەوە. ئەو کاتەی گەیشتە سەر ڕێگا سەرەکییەکە، خۆر گەیشتبووە ناوڕاستی ئاسمان و قرچە قرچی نیوەڕۆ بوو. ئەم کابرا هەژارەش گۆپاڵێکی گەورەی بەدەستەوە و پشتەماڵێکی کۆنیشی بە شانەوە بوو.

ئەم پیاوە سێ مەڕی هێنابوو بۆ شارۆچکەکە و دوای فرۆشتنیان، بە پارەکەی قەرزە کۆنەکانی دابووەوە و هەندێك شت و مەکیشی پێ کڕیبوو بۆ ماڵەوە.

هیچ کەس بەدەرەوە نەبوو. کەمێکی تر ڕۆیشت و لەژێر سێبەری دار خورمایەکدا پاڵی دایەوە. لە نزیکیەوە بیرێکی لێبوو. ئیتر هەندێك ئاوی هەڵکێشا و خۆی تێر ئاو کرد و جوان دەست و دەم و چاویشی شۆرد. ئیتر دوای ئەوە هەستایە سەرپێ و تەماشایەکی ئەو دەشت و زنجیرە شاخانەی بەردەمی خۆی کرد کە دەبوو تا ئێوارە بگاتە ئەوێ. هەر کە ویستی بکەوێتە ڕێ و بڕوات، ئەسپ سوارێك لەدوورەوە بەدیارکەوت. کەسێکی بێگانە بوو بەڵام زۆر دەوڵەمەند دیاربوو. بە ئەسپە شۆخەکەیەوە تەپ و تۆزی لەوناوە هەستاند و دای بەلایدا و ڕۆیشت. ئیتر هەتا ئەسپ سوارەکە لەچاو ون بوو ئەم تەماشای کرد و لەبەر خۆیەوە ئاخێکی قوڵی هەڵکێشا و وتی: "خوایەگیان من کەسێکی هەژارم. کەچی ئەو خەڵکە هەموو خاوەنی ئەسپ و وشترن و بێ ئەوەی هیچ ماندوو ببن بۆ هەرکوێ بیانەوێت دەڕۆن. ئەوەتا من گوێدرێژێکیشم نییە." پاشان کاکی ڕێبوار بە دەم خەمبارییەکی زۆرەوە کەوتەوە ڕێ. ئیتر بەدرێژایی

ڕێگاکەی هەر بیری لەو چەرمەسەرییانە دەکردەوە کە بە هۆی هەژارییەوە تووشی هاتبوون. پاشان چاوی کەوت بە کابرایەك کە لەژێر گەرمای بەتینی ئەو خۆرە گەرمەدا بە پاچێکەوە خەریکی چاڵ هەڵکەندن بوو. پیاوە دەست کورتەکە ناخۆشییەکانی خۆی بیر چووەوە و ڕۆیشت بۆلای کابرا و سڵاوی لێکرد. کابراش سڵاوی لێکردەوە و هەر خەریکی چاڵ هەڵکەندنەکەی خۆی بوو.

پیاوە هەژارەکەش تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد و بۆی دەرکەوت کە ئەم پیاوە لە بەیانییەوە خەریکی چاڵ هەڵکەندنە، چونکە زیاتر لە دەچاڵی هەڵکەندبوو.

خۆی پێنەگیرا و دووبارە بە پیاوەکەی وتەوە:

- خاڵە گیان ماندوو نەبیت.

ئەم جارەیان پیاوەکە وازی لە پاچ وەشاندن هێنا و وتی:

- زۆر سوپاس. ئینجا دەستی بۆ پیاوە هەژارەکە درێژ کرد. ئەمیش دەستی گرت و لە چاڵەکە هێنایە دەرەوە. پیاوەکە تەواو دەمی وشك ببوو بۆیە لە گۆزەکەی تەنیشتیەوە کەمێك ئاوی خواردەوە. دواتر بێ ئەوەی هیچ بڵێت ڕۆیشتەوە ناو چاڵەکە و دەستی کرد بە هەڵکەندنی. پیاوە هەژارەکە بەم ڕەفتارەی کابرا تەواو سەری سوڕما و لەسەر گڵەکە دانیشت و لێی پرسی:

- باشە ئەم هەموو چاڵەت بۆ هەڵکەندووە؟

پیاوەکە پاچەکەی بەرزکردەوە و بەهەموو هێزێکییەوە دایەوە بەزەویدا. دواتر بە دەنگێکی ماندووەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

- قابیلە چی دەکەم، بەدوای پارەکانمدا دەگەڕێم.

- پارە؟

- بەڵێ، بەڵێ، پارە. زووزوو دز و جەردە دەدات بەسەر گوندەکەماندا و منیش لە ترسی ئەوان پارەکەمم لێرەدا شاردبووەوە.

- باشە بەڵام ئەی لەو شوێنەی پارەکەت تێدا شاردەوە نیشانەیەك شتێکت دانەنا؟

- تۆبڵیی دامنەنابێت.

- ئەی کوا؟

پیاوەکە لە پێشدا تەماشایەکی ئاسمانی کرد و دواتر وەڵامی دایەوە و وتی:

- کە شاردمەوە پەڵە هەورێکی ڕەش بەسەر سەرمەوە بوو، ڕێك لەژێر ئەوەدا شاردبوومەوە.

پیاوە هەژارەکە یەکسەر ڕووی کردە پەروەردگار و کەوتە نزاکردن. چاوێکی بەخۆیدا خشاندەوە و شەرمی کرد لەو بیرکردنەوانەی کە بەهۆی دەوڵەمەند نەبوونیەوە بە خەیاڵیدا هاتبوون. ئیتر لەسەر ئەو حاڵەی تێیدابوو سوپاسی خوای گەورەی کرد. ڕاستە تەنانەت گوێدرێژێکیشی نەبوو بتوانێت بۆ سواریی بەکاری بهێنێت، بەڵام خوای گەورە ژیرییەکی باشی پێ بەخشیبوو کە بتوانێت بڕیاری ڕاستی پێ بدات و بیری پێ بکاتەوە. دەی خۆ هەموو کەسێك خاوەنی ئەو ژیرییە نەبوو. پیاوە هەژارەکە وتی: "خوایەگیان ئەم ژیرییەی بە منت بەخشیوە لێم مەستێنەرەوە، من بەم حاڵەشمەوە کاری خۆم دەکەم و خێزانەکەم بەخێودەکەم." ئیتر پیاوە هەژارەکە پاش ماوەیەك بیرکردنەوە کابرای چاڵ هەڵکەنی جێهێشت و کەوتەوە ڕێ.

# دووپشک

لە تەنیشت خانوویەکی کۆن و وێرانە کە لە بەرد دروستکرابوو، پیاوێکی تەمەن سی ساڵ دەرکەوت. ئەم کەسە قاسم ئەفەنی بوو کە هیچ دەمێك هۆشی لەلای خۆی نەبوو، بەڵکو بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە هەمیشە مەست و سەرخۆشە. ڕۆژێکیان دەم و چاو و جل و بەرگی هەتا بڵێی پەڕپوت و چڵکن بوو. کە بە ڕێدا دەڕۆیشت هەمیشە بەملا و ئەولادا دەکەوت. جا کە بەم حاڵەوە خۆی بینی شەرم دایگرت بەوجۆرە بچێتە ناو خەڵکەوە. بۆیە لایدایە سوچێکەوە و لە بن دیوارێکدا دانیشت. بە هەزار حاڵ چاوێکی هەڵبڕی و ویستی تەماشایەکی شەقامەکە بکات، کەچی یەك کەسی بە دوو کەس دەهاتە پێش چاو و هەندێکی تر لەبەرچاویدا وەکو هەڵم دەجولانەوە. لەم کاتەدا پیرێژنێك سەرنجی قاسمی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. وا دیاربوو کە کۆڵێکی قورس لەسەر شانی بێت. وازی لە تەماشاکردنی پیرێژنەکە هێناو خێرا بەلۆعەی کردەوە و جوان جوان دەم و چاوی شۆرد. لێڵییەکەی بەرچاوی نەما و کەمێك هاتەوە سەر خۆی. ئیتر هەر ئەوەندەی هۆشی هاتەوە، خێرا گەڕا بەدوای ئەو پیرێژنەدا کە کەمێك لەمەوبەر بە بارێکی قورسەوە بینیبووی. پیرێژنەکە ویستی لابداتە کۆڵانەکەی ئەودیو، ئەمیش خێرا بە ڕاکردن دوای کەوت. هەر کە بە دایە حاجییەکە گەیشتەوە یەکسەر تورەکەکەی پشتی ڕاکێشا. هەر کە پیرێژن ئاوڕی دایەوە

و بینی وا قاسم ئەفەنی کە بە خراپەکاری بەناوبانگ بوو لە پشتییەوە وەستاوە، ترسا و وتی:

- چییە ئەوە تورەکەکەم دەدزی؟

قاسم ئەم قسەیەی زۆر پێ ناخۆش بوو، بەڵام پاشگەز نەبووەوە لەوەی کە بە نیازبوو ئەنجامی بدات.

- نەخێر نەنەگیان دزی چی و شتی چی. وتم تورەکەکەت قورسە مۆڵەتم بدە تاوەکو ماڵەوە بۆت هەڵبگرم.

نەنە پیرە وتی:

- ئەها، تێگەیشتم.

بەڵام ڕاستییەکەی هێشتا هەر متمانەی پێ نەکرد. بەڵام ڕازی بوو و قاسمیش تورەکەکەی دا بەشانیدا و ئەمیش لەدوایەوە کەوتە ڕێ.

قاسم بەناو کۆڵانەکانی قاهیرەدا ڕۆیشت و بەتەنیشت کەناراوەکانی ڕووباری نیلدا تێپەڕی. پاشان تورەکەکەی بۆ دایە حاجی بردەوە ماڵەوە کە کوخێکی بچووك و خنجیلانە بوو. دایە حاجی لەسەر ئەم هاوکارییەی هەزار و یەك نزای بۆ قاسم کرد و پێی وت:

- زۆر سوپاس کوڕم. ڕاوەستە با خواردنێ شتێکت بۆ ئامادە بکەم. پاشان ڕۆیشتە ناو کوخەکەوە. پاش کەمێك هاتە دەرەوە و بوخچەیەکی بەدەستەوە بوو. پاش ئەوەی نانەکەی پێدا، هات هەروەك دایکێکی بەشەفەقەت، کەوتە ئامۆژگاری کردنی قاسم.

- ئاخ کوڕم، ئەو ڕێیەی تۆ تێی کەوتویت هیچ باش نییە. دە بەسە ئیتر واز لەو شتانە بێنە. تەماشاکە تەمەنت چەندە کەچی

هێشتا هەر ئاقڵ نەبویت.

قاسم بەم قسانەی دایە پیرە ویژدانی جولا، بەڵام دیسان نەیتوانی بەڵێن بدات دەستبەرداری خورەوشتە خراپەکانی بێت. بۆیە سەری دانەواند و بوخچەکەی هەڵگرت و دورکەوتەوە. ئیتر لەژێر یەکێك لە سێبەری درەختەکانی دەوروبەری ڕووباری نیلدا دانیشت، خواردنەکانی نەنەی دەرهێنا و سکی خۆی پێ تێرکرد.

پاش ئەوەی تێری خوارد، پاڵی دایەوە بەدرەختەکەوە و خەوی



لێکەوت.

دایە حاجی گۆزەیەکی بچووکی گرت بە دەستەوە و چووە نزیك ڕووبارەکە. کە گۆزەکەی پڕکرد و ویستی بگەڕێتەوە، بینی وا دووپشکێکی گەورە لەسەر تاشەبەردێکی ناو ڕووبارەکە وەستاوە. لە ناکاو بۆقێکیش سەری لە ئاوەکەوە دەرهێنا و دووپشکەکە چووە سەر پشتی بۆقەکە و هەردووکیان پێکەوە پەڕینەوە بەرەو پیرێژنەکە کە لە کەناری ڕووبارەکەدا وەستابوو.



پیرێژن لە ترسی دووپشکەکە ڕایکردە سوچێکەوە. دووپشکەکە بەرەو ڕوی قاسم کەوتە ڕێ، کە بۆ خۆی لەژێر دارخورمایەکدا نوستبوو. دایە پیرە دەستی هێنایەوە ویستی دووپشکەکە بکوژێت، بەڵام ڕێك لەو کاتەدا مارێك لەناو گژوگیاکەوە بەدەر کەوت. دووپشکەکە نەیهێڵا مارەکە بدات بە قاسمەوە. پاش شەڕێکی بچووك لە نێوان دووپشك و مارەکەدا، دووپشکەکە دای بە مارەکەوە و ژەهراوی کرد. مارەکەش لەسەر لمەکە کەمێك گەوزا و دواتر لە پەلوپۆ کەوت. پیرێژنەش بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای ئەم دیمەنانەی کرد و دواتر چوو قاسمی بەئاگا هێنایەوە. ئینجا یەکە بە یەکەی ئەو شتانەی ڕوویاندابوو هەمووی بۆ گێڕایەوە.

- کوڕی شیرینم مارێك هات خەریك بوو پێتەوە بدات، کەچی خوای گەورە دووپشکێکی بۆ نارد پێوەی دا و کوشتی. ئاوا بەم جۆرە ڕزگارت بوو.

قاسم تەماشایەکی مارەکەی کرد کە بەهۆی پێوەدانی دووپشکەکەوە مردار ببووەوە و تەماشایەکی دووپشکەکەشی کرد کە لەئاوەکەدا بەسەر پشتی بۆقەکەوە بوو دەگەڕایەوە لانەکەی خۆی. ئیتر وتی:

- پەروەردگار زۆر بە بەزەییە. بەندەیەکی گوناهکاری وەکو منی پاراست. لەوانەیە ئەمە پاداشتی هەندێك کاری چاك و خێر بووبێت کە پێشتر ئەنجامم داون.

نەنە:

- دەی کە دەتەوێت لەو کارە خراپانەت پاشگەز بیتەوە و دەست هەڵبگریت، بۆچی وەستاویت. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بگەڕێیتەوە بۆلای ئەو خوایەی کە بەو هەموو گوناهەشتەوە، لە دەستی مارەکە

ڕزگاری کردی؟

قاسم تەواو خەیاڵی ڕۆیشتبوو و ئاگای لەخۆی نەمابوو، هەر کە نەنەگیان دەستی هێنا بەسەریدا، یەکسەر هاتەوە سەر خۆی.

- دایە پیرەگیان تۆ شاهێد بە ئەوا من لە ئێستە بەدواوە تۆبە دەکەم و پەشیمان دەبمەوە. ئینجا هەستایە سەر پێ و وتی بە پشتیوانی خوای گەورە چیدی خراپە ئەنجام نادەم. دایە پیرەگیان ئەوا هەر ئێستا دەڕۆم بۆ بازاڕ و بەدوای کارێکدا دەگەڕێم، تۆش نزام بۆ بکە.

نەنە گوڵچین بزەیەکی کرد و نزای زۆری بۆ قاسم کرد و وتی: "نابێت هیچ چاکەیەك بە کەم بزانین و دەبێت ئەوەی لەتواناماندایە ئەنجامی بدەین."

# بەخشندەیی

دەمەو عەسەر هەر ئەوەندەی هەوا فێنکی کرد و تیشکی خۆر تینی نەما، وردە وردە بازاڕ جوڵەی تێکەوت و قەرەباڵغ بوو. ئیتر ئەوانەی کڕین و فرۆشتنی ئەو ڕۆژەیان تەواو دەکرد، یەکسەر بەرەو ماڵەوە ملی ڕێیان دەگرتە بەر و دەگەڕانەوە.

ئەوەبوو لە تەنیشت یەکێك لە دوکانی گۆشت فرۆشەکانەوە پیرێکی ڕیش سپی دەرکەوت کە جلوبەرگێکی پاك و خاوێنی لەبەردابوو. مام حاجی خۆیدابوو بەسەر گۆچانەکەیدا و چووە ناو خەڵکەکەوە و لەوێوە تێپەڕی. پاشان دای بەلای دوکانی شەربەتەکاندا و ویستی لەوێوەوە بچێتەوە سەر بازاڕی کوتاڵ فرۆشەکان. ئیتر لەوکاتەدا کەسێکی هەژار لێی نزیك بووەوە و پێی وت:

- چەند ڕۆژە هیچم نەخواردووە، لەبەر خاتری خوای گەورە پارەی نانێکم بدەرێ.

مام حاجیش ئاوڕی دایەوە تەماشایەکی کرد.

سواڵکەرەکەش بە دەنگێکی پڕ لە چەرمەسەرییەوە وتی:

- تۆ لە کەسێکی بەخشندە دەچیت، لەبەر خاتری خوای گەورە یارمەتییەکم بدە.

مام حاجی هەر کە گوێی لە ناوی "خوا" بوو، یەکسەر لەشوێنی خۆی وەستا و لەرز دایگرت. ئەمجارەیان سواڵکەرەکە بە چاوێکی پڕ لەترسەوە سەیرێکی هەژارەکەی کرد. هەر کە مام حاجی لەرزەکەی نەما، هەموو گیرفانەکانی گەڕا و بە سواڵکەرەکەی وت:

- هیچ شتێکم نییە پێتی بدەم، کە وایە با بڕۆین بۆ بازاڕی کۆیلەکان و لەوێ بمفرۆشە. بە پارەکەشی پێداویستییەکانت جێبەجێ بکە. بەم شێوەیە سوێندەکەی تۆش ناکەوێت.

سواڵکەرەکە کە مرۆڤ بەزەیی بە حاڵیدا دەهاتەوە لەبەرامبەر ئەم داوایەی مام حاجیدا واقی وڕما. ئیتر دوای ئەوەی ماوەیەك گفتوگۆیان کرد، سواڵکەرەکە چاری نەما و دەبوو بە پێشنیارەکە ڕازی بێت. ئیتر پێکەوە ڕۆیشتن و پیاوێکی دەوڵەمەندیش هات مام حاجی لێکڕین بە چوارسەد پارچە ئاڵتون.

سواڵکەرەکە پارەکەی خستە گیرفانییەوە و بەرەو ماڵە پەڕپوتەکەی کەوتە ڕێ. مام حاجیش دوای پیاوە دەوڵەمەندەکە کەوت و پێکەوە گەیشتنە ماڵەوە.

چەندین ڕۆژ تێپەڕی و پیاوە دەوڵەمەندەکە کاری گرانی بە مام حاجی نەکرد. بەڵام ویژدانی مام حاجی ئەمەی قبوڵ نەکرد و چووە لای گەورەکەیی و پێی وت:

- دەمەوێت کارم پێ بکەیت.

- ئاخر تۆ پیریت.

- دەزانم. بەڵام تۆش بە پارە منت کڕی، ئەی نابێت منیش بە کارکردنم دڵی تۆ ڕازی بکەم!

ئیتر پیاوە دەوڵەمەندەکەش بۆ ئەوەی دڵی مام حاجی نەشکێنێت پێی وت:

- باشە دەی هەرچی بەردی ناو باخەکەیە ببەرە نزیک ئەستێڵەکەوە.



خاوەن ماڵەکە سواری ئەسپەکەی بوو و ڕۆیشت بەرەو شار. مام حاجیش چووە سەر کارە تازەکەی.

کە شەو داهات گەورەکەی لە شار گەڕایەوە و دەرگای باخەکەی کردەوە تا بزانێت مام حاجی خەریکی چییە. بینی وا هەموو بەردەکانی گواستۆتەوە و خەریکی ئاودانی باخەکەیە.

کابرا زۆر سەری سوڕما لەوەی چۆن مام حاجی ئاوا زوو



کارەکەی تەواو کردووە. هەربۆیە نەیزانی چی پێ بڵێت. کەچی مام حاجی هات و داوای کارێکی تری لێ کرد. ئەویش لە وەڵامدا:

- دەمەوێت دیوەخانێك بۆ میوانەکانم دروست بکەم بۆیە لە بەیانییەوە دەست بکە بە خشت بڕین.

هەر کە ڕۆژ بووەوە مام حاجی قۆڵی لێ هەڵماڵی و دەستی کرد بە خشت بڕین. وا دیاربوو گەورەکەشی سەرقاڵی خۆ کۆکردنەوە بوو بۆ گەشتێکی یەك هەفتەیی. ئیتر دوای هەفتەیەك کە گەڕایەوە بینی وا دیوەخانەکەش و دیواری پەرژینی باخەکەش تەواو بووە. ئیتر خۆی پێ نەگیرا و مام حاجی دۆزییەوە و پێی وت:

- لەبەر خوای گەورە پێم بڵێ تۆ کێیت؟ سەرباری ئەو تەمەنە زۆرەشت کەچی لە هەموویان زیاتر کار دەکەیت. چۆن توانیت ئەم هەمووکارە تەواو بکەیت؟

مام حاجی وتی:

- لەبەر ئەوەی ناوی خوات برد، دەبێت هەموو شتێکت بۆ باسبکەم. ئیتر لەگەڵ گەورەکەیدا چوونە باخەکە و دانیشتن.

- مام حاجی وتی:

- من خدری زیندەم.

ئیتر خدری زیندە چی بەسەر هاتبوو هەمووی بۆ پیاوە دەوڵەمەندەکە گێڕایەوە.

دەوڵەمەندەکە لە شەرمدا سەرتاپای گیانی بوو بە عارەق.

بەڕێزێکەوە وتی:

- ئەی بەندەی خۆشەویستی خوا، گەردنم ئازاد بکە ئەگەر

بوویێتمە هۆی زوویرکردنت. هەموو سەروەتەکەمت پێ دەبەخشم و دەتوانیت بە دڵی خۆت بەکاری بهێنیت.

- من لەبری دەوڵەمەندی، پەرستشی خوای گەورە هەڵدەبژێرم. سەربەستم بکە بۆ ئەوەی ئیتر بە ئاسوودەیی پەرستشی خوای گەورە بکەم.

- تۆ سەربەستیت، بۆ کوێ دەتەوێت دەتوانیت بڕۆیت و چیت دەوێت دەتوانی بیکەیت.

مام حاجی کەلوپەلەکانی لە ماڵەکە کۆکردەوە و کاتێك ئەوێی بەجێ هێشت ئەم دوعایەیی کرد و وتی: "زۆر سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی کردە کۆیلە و دواتریش ئازادی کردم."

# جەژنانە

خاڵە بارام لەبەردەم پەنجەرەی ژووری نانخواردنەکەیاندا سەری کز کردبوو و بە بێزارییەوە دەیڕوانیە شەقامەکە. دەیبینی وا ئەو خەڵکە لە بازاڕەوە بەدەستی پڕ دەگەڕێنەوە و هەموو جلی تازە و پێڵاو و کەرەستەی جەژنیان بۆ ماڵ و منداڵەکانیان کڕیوە و ئەمیش هیچی پێ نەکردراوە. کە هاوسەرەکەی خاڵە بارامی بەم شێوەیە بینی، بەبێدەنگییەوە چووە تەنیشتی و پێی وت:

- پیاوەکە ئەوە خێرە وا بێزاری، بیر لەچی دەکەیتەوە؟

خاڵە بارامیش چی لە دڵدا بوو هەمووی بۆ هاوسەرەکەی هەڵڕشت.

وتی وا سبەینێ جەژنە و دوو فلسمان پێ نییە بچین جلی جەژن بۆ منداڵەکان بکڕین و جەژنانەیان بدەینێ. هاوسەرەکەشی بیرۆکەیەکی باشی بۆ هات و پێی وت:

- کەواتە تۆش هەستە بچۆ بۆلای خەلیفە و باسی حاڵمانی بۆ بکە. دڵنیام لەوەی هاوکاریمان دەکات.

خاڵە بارام بەناچاری لە ماڵ چووە دەرەوە و خۆی گەیاندە ماڵی خەلیفە. کە گەیشتە ئەوێ و باسی حاڵی خۆیی و خێزانەکەی بۆ کرد، ئەویش کیسەیەك پارەی ئاڵتوونی دایە. خاڵە بارام لە خۆشیاندا خەریك بوو باڵ بگرێت. بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و لەو کاتەدا کە خەریك بوو بچێتە ژوورەوە، هاوڕێیەکی هات

بۆلای و سەری دانەواند و وتی:

- بارام خۆت دەزانی وا بەیانی جەژنە! باوەڕبکە یەك عانە چییە پێم نییە خواردنی جەژن بۆ منالەکانم بکرم. هاتووم بۆلات شتێك پارەت بە قەرز لێوەربگرم ئەگەر لاتبێت.

ئەویش دەستی کرد بە گیرفانیدا و بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە کیسە ئالتوونەکەی دایە.

- فەرموو بچۆ بەم پارەیە دلی مندالەکانت خۆش بکە.

هاوڕێکەشی بەدلخۆشییەکی زۆرەوە کیسەکەی لێ وەرگرت و ڕێی بازاڕی گرتەبەر. دەیویست بەر لەوەی درەنگ بکات شتومەکەکانی بکڕێت و بگەڕێتەوە لای مال و مندالەکەی. لەوکاتەدا کە بە کۆلانێکدا تێدەپەڕی هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆی بینی. دیار بوو خەمبار و بێتاقەت بوو، سەری دانەواند و داوای یارمەتی لێ کرد. دیاربوو ئەویش پارەی پێ نەبوو شتی جەژن بۆ منالەکانی بکڕێت. هاوڕێکەشی بێ بیرکردنەوە دەستی کرد بە گیرفانیدا و بێ ئەوەی کیسەکە بکاتەوە و یەك دیناری لێ دەربێنێت، پێشکەشی هاوڕێکەی کرد.

خالە بارام هاتەوە بۆ مالەوە و هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ خێزانەکەی گێڕایەوە. ئەویش پێی وت کە بچێت بۆلای نزیکترین هاوڕێی کە ناوی نەژاد بوو. خالە بارامیش بە نیازی ئەوەی برە پارەیەك لای هاوڕێکەی بە قەرز وەربگرێت و جەژنی پێ بکەنەوە، بەرەو مالی نەژادی هاوڕێی کەوتە ڕێ. کە گەیشتە مالیان، لە دەرگای دا و نەژاد دەرگای بۆ کردەوە. بارام نەیویست بچێتە ژوورەوە و هەر بەپێوە مەبەستی سەردانەکەی ڕوونکردەوە.

- وا جەژنە و پێویستم بە بڕێك پارەیە جلوبەرگی جەژنی پێبکرم

بۆ منداڵەکانم. ئەگەر لات بێت کەمێك پارەم بەقەرز بدەیتێ.

نەژاد ڕۆیشتە ژوورەوە و کە گەڕایەوە کیسەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا و وتی:

- فەرموو، ئەم کیسەیە پڕە لەپارە. هەمووی بۆ تۆ. نۆشی گیانتان بێت.

خاڵە بارام بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە ماڵەوە. کە لە گەڵ خێزانەکەیدا کیسەکەیان کردەوە زۆر سەریان سوڕما.

چونکە ئەمە هەمان ئەو کیسەیە بوو کە خەلیفە پێی دابوون. ئەم بڕە پارەیە لە نێوان ئەم سێ برادەرە خۆشەویستەدا دەستاو دەستی کرد و هاتەوە لای خاوەنی یەکەمی.

خەلیفە کاتێك ئەمەی بیست، هەر سێ هاوڕێکەی بانگکرد بۆلای خۆی و پێی وتن:

- من یەکەمجار ئەو کیسەیەم دابوو بە بارام، بەڵام ئەو خۆبەختانە چوو بەدەم کێشەی هاوڕێکەیەوە. ئیتر بەم شێوەیە کیسە پارەکە لە نێوان خۆتاندا ئەم دەست و ئەو دەستی پێ کرا، تا گەیشتەوە لای بارام. بەڕاستی زۆر دڵخۆش بووم بەم گیانی هاوکارییەی وا لە نێوانتاندا ڕەگی داکوتاوە. ئەوە بڕیارمدا یەکی کیسەیەك پارەش بدەم بەو دوو هاوڕێیەی ترت. ئیتر بەمجۆرە خەلیفە لە ڕۆژی پیرۆزی عەرەفەدا دڵی ئەو کۆمەڵە خێزانەی خۆش کرد و ئەوانیش وەك هەموو خەڵکی شارەکە لە دڵخۆشی و کامەرانیدا جەژنیان کردەوە.

# خاوێنترین

چەند کەسێك لەگەڵ بانگی شێواندا خۆیان کرد بەناو کۆڵانەکانی شاردا. ئەو ئەسپ سوارەی لەپێش ئەوانی ترەوە دەڕۆیشت، بانگی کردە هاوڕێکانی و پێی وتن:

- برادەران لێرەوە دەڕۆین. ئیتر ئەسپەکەی بەرەو دیوەخانی سەر تەپۆڵکە بەرزەکە تاودا و دەیانویست هەرچی زووترە ماندوویێتییان بڕەوێتەوە.

ئەو شوێنەی بۆی دەڕۆیشتن ماڵی زانای گەورەی شار، مستەفا ئەفەندی بوو. هەر لەبەردەرگای ماڵەکەدا یەکێك هات و بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردن. کاتێك میوانەکان لە ئەسپەکانیان دابەزین و فەرموویان لێکرایە ژوورەوە، خەڵکەکەی لە دیوەخان بوون، لە حەوزی ناو باخچەکە خەریکی دەستنوێژ هەڵگرتن بوون. ماڵی زانای گەورە ئەوەندە قەرەباڵغ بوو کە هەمیشە لەبەر میوان و خوێندکارەکانی جمەی دەهات.

مستەفا ئەفەندی دەستنوێژی هەڵگرت و بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی میوانەکانی کرد. هەروەها زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی ئەو چەند هاوڕێ خۆشەویستەی کە دەمێك بوو تامەزرۆی بینینیان بوو.

ئیتر باوەشی پێدا کردن و فەرمووی لێکردنە لای سەرەوە و وتی:

- ئێمەش بە نیازبووین بۆ نوێژ ڕاوەستین. خۆ برسیتانە؟ ئیتر هەر خۆشی وەڵامی دایەوە و وتی جا تخوا پرسیاری وا لە میوان کراوە. ئینجا محەمەدی خوێندکاری بانگکرد و پێی وت:

- خێرا کاوڕێك سەرببڕن، میوانەکانمان لە شوێنی دوورەوە هاتوون.

دوای نوێژی شێوان، کاوڕیان سەربڕی و خستیانە ناو مەنجەڵ و جێیانهێشت بەشێنەیی بکوڵێت. لەولاشەوە خێرا نانی گەرم و تازەیان سازکرد و لە ژووری میوانەکەشدا سفرەیەکی دوور و درێژیان ڕاخست.

کەمێك دوای ئەوەی دەستیانکرد بە نان خواردن، کاك مستەفا خۆشەویستترین خوێندکاری خۆی کە محەمەد بوو، بانگکرد و پێی وت:

- ئادەی کوڕی خۆم بچۆ دوو خاوێنترین شوێنی ئەم کاوڕەم بۆ سوورکەرەوە بۆم بێنە.

ئیتر میوانەکان بەدەم نانخواردنەوە دەمەتەقێیەکی خۆشیان کرد. دوای نیو کاتژمێر محەمەد زمان و دڵی ئاژەڵەکەی لە تاوەیەکدا سور کردبووەوە و هێنای. محەمەد گۆشتەکەی وەکو دەنوکی کەو سور کردبووەوە بەسەر میوانەکاندا گێڕای.

موستەفا ئەفەندی وتی:

- دەك دەست خۆش بێت. ڕێك ئەو شوێنانەت هێناوە کە من دەمویست.

بەڵام ئەو میوانانەی لەوێ ئامادەبوون هیچ لەمە تێنەگەیشتن.

بۆ ڕۆژی دووەم دوو کاوڕی تریان سەربڕی بۆ میوانەکان و مەنجەڵ خرایە سەر و خواردن پێگەیشت.

دووبارە لە ژووری میوانەکە سفرەیان ڕاخست و هەمووان بۆ نانخواردن هاتنە پێشەوە. بەهەمان شێوەی جاری پێشوو، مستەفا ئەفەندی محەمەدی بانگکردەوە و پێی وت:

- دوو پیسترین شوێنی کاوڕەکەمان بۆ سوورکەرەوە و بۆمان بێنە.

محەمەد بە ڕێزەوە لە سالۆنەکە چووە دەرەوە و دووبارە لە تاوەیەکدا زمان و دڵی کاوڕەکەی هێنایەوە.

مستەفا ئەفەندی:

- ئافەرین محەمەد ئەمەشیانت زانی. میوانە خۆشەویستەکانم لە ڕاستیدا پیسترین و پاکترین ئەندامی لەشی مرۆڤ و ئاژەڵ زمان و دڵیەتی. دەبێت مرۆڤ بە گفت و قسەی چاك و باش زمانی بە پاکی ڕابگرێت. هەروەها دەبێت دڵیشی بەرامبەر خوای گەورە بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو هەموو جوانی و چاکییە بڕژێنە ناو دڵیەوە.

بەم جۆرە میوانەکان تەواو لە مەبەستی مستەفا ئەفەندی تێگەیشتن و لەسەر ئەم پەند و ئامۆژگارییە جوانەی دەستخۆشییان لێکرد.

# هەواڵی کەڵەشێرەکە

لەناو بازاڕدا پیاوێك بەخێرایی هەنگاوی دەنا و بە دوای حەزرەتی موسادا دەگەڕا. بەر لەوەی بگاتە بازاڕ ژنێکی پیری بینی و هەواڵی حەزرەتی موسای لێ پرسی. ئەویش پێی وت کە وا لە کەنار ڕووبارەکەدایە. پیاوەکە بەرەو ناونیشانەکە ڕۆیشت، کە گەیشتە ئەوێ حەزرەتی موسای دۆزییەوە و پێی وت:

- ئەی موسا دەمەوێت لە زمانی گیانداران تێبگەم، دوعام بۆ بکە بەڵکو خوای گەورە ئەو داواکارییەم لێ قبوڵ بکات.

حەزرەتی موسا (خوا لێ ڕازیبێت) فەرمووی:

- زانینی هەموو شتێك باش نییە. لەوانەیە ئەمە زیانت پێ بگەیەنێت. من پێم باشە واز لەم داواکارییەت بهێنیت. بەڵام هەرچەندە حەزرەتی موسا هەوڵی لەگەڵدا و ئاگاداری کردەوە کەچی پیاوەکە لە داواکارییەکەی پاشگەز نەبووەوە. ئەویش دڵی پیاوەکەی خۆشکرد و وتی:

- باشە دوعات بۆ دەکەم.

هەفتەیەك بەسەر ئەمەدا تێپەڕی بوو. ڕۆژێکیان پیاوەکە خەریك بوو لەماڵەوە بێتە دەرەوە، حەزرەتی موسا هات بۆلای و پێی وت:

- خوای گەورە داخوازیەکەتی هێناوەتە جێ و لەمڕۆ بەدواوە دەتوانیت لە زمانی هەموو گیانداران تێبگەیت. لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداریکردەوە کە باوەڕ بە هەموو قسەیەك نەکات و ڕەنگە ئەمە کارێکی مەترسیدار بێت.

پیاوەکە گوێدرێژ و گاکەی برد بۆ کێڵگە و مریشك وسەگ

برسییەکەشی، کە یەك هەفتەی ڕەبەق بوو هیچیان نەخواردبوو لە ماڵەوە مانەوە.

- سەگەکە وتی حاڵی من چی بەسەر دێت. باشە تاکەی ئەم خاوەنەی من خواردنم ناداتێ.

کەڵەشێرەکەش باڵەکانی ڕاوەشاند و ئەو ناوەی کرد بە تەپوتۆز و چەند دەنکە گەنمێکی دۆزییەوە و خواردی، پاشان وتی:

- هیچ خەم مەخۆ سەگی هاوڕێم. کەمێك سەبرت هەبێت تەماشا ئەوەتا خوای گەورە لەم خۆڵەوە بژێویم بۆ دەنێرێت.

پیاوەکە تا نزیکی ئێوارە کاری کرد و گەڕایەوە ماڵەوە. دواتر ئاژەڵەکانی کردە گەوڕەکەیانەوە. پاشان لەلایەکەوە ئالیکی دەدا بە گیاندارەکان و لەلایەکیشەوە گوێی بۆ قسەکانیان شلکردبوو.

گاکە بەدەم خواردنی ئالیکەکەی بەردەمیەوە وتی:

- ئەی گوێدرێژی هاوڕێم ئەمە کەی حاڵە من هەموو ڕۆژێك تا ئێوارە کاردەکەم و هیچ پشووش نادەم. تۆش تەنها شت دەگوازیتەوە و تەواو. پاشان بۆخۆت تا ئێوارە لەژێر سێبەردا دەحەوێیتەوە. منیش ئەوەی دەیخۆم لە لوتمەوە دەیهێننەوە دەرەوە.

وەك ئەوەی بەس نەبێت، تا ئێوارە زەویم پێ دەکێڵن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا لە کێڵگەکە دێینەوە بەشی من کوتەك خواردنە.

گوێدرێژەکەش دڵی دایەوە و چەند ئامۆژگارییەکی فێڵبازانەی کرد:

- جا شت هەیە لەوە ئاسانتر؟ ئەو ئالیکەی بۆت دادەنێن مەیخۆ و هەر کە ڕۆژیش بووەوە خۆت بکە بە نەخۆش، ئاوا بۆخۆت لە کارکردن ڕزگارت دەبێت.

گاکە قسەکانی گوێدرێژەکەی بەدڵ بوو. بۆیە لەخۆشیاندا دەم و چاوی گەشایەوە و هەر بیری ئالیك خواردنیشی نەما. پاشان بە گوێدرێژەکەی وت:

- ڕاست دەکەیت. باشە بۆچی تا ئێستا خۆم بیرم لەمە نەکردبووەوە. ئیتر هەر لەوێدا خۆی تەختی زەوی کرد و ئالیکەکەشی بۆ گوێدرێژەکە جێهێشت.

پیاوەکەش بە پێکەنینەوە گەورەکەی جێهێشت و چووەماڵەوە و لەبەرخۆیەوە وتی ئەی گوێدرێژی ساختەچی شەرتبێ پێت نیشان بدەم.

بۆ ڕۆژی دواتر پیاوەکە لەگەڵ مەلا بانگداندا چووە گەورەکە گاکە بەرێت بۆ جووت. کەچی گاکە لە شوێنی خۆی نقەی نەکرد. ملەقوتەیەکی کرد و وا خۆی پیشاندا کە نەخۆشبێت. بۆیە هەر نرکە و ناڵەی بوو، خوا خوای بوو نەخۆش دەرکەوێت. پیاوەکە هیچی نەوت و ئەم جارەیان گوێدرێژەکەی برد و کێڵگەکەی بەو کێڵا. گوێدرێژەش هەتا ئێوارە ئەم گاسنەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا. ئیتر پاش ماندووبوونێکی زۆر گەڕایەوە گەورەکەی. زۆر پەشیمان بوو لەو بیرۆکەیەی بە گاکەی وتبوو. ئێوارە کاتێك خاوەنەکەیان ئالیکی بۆ ئامادە دەکردن، گاکە هەر لە شوێنی خۆیەوە و بە پاڵکەوتنەوە لە گوێدرێژی هاوڕێی پرسی:

- ئەمڕۆ حاڵت چۆن بوو، خۆش بوو؟

گوێدرێژەکە تەواو شەکەت ببوو و هێزی لە بەر بڕابوو.

- بەدەم کا جوینەوە بە مڵچەمڵچ وتی قابیلە چۆن بووم، پشتم شکا. هەتا بانگی ئێوارە خەریکی زەوی کێڵان بووم. ئیتر گاکەی ترساند و وتی:

- ئەوە لەبەر خاتری برادەرایەتیمان پێت دەڵێم، ئەگەر وا بەردەوامبیت لەوەی خۆت نەخۆش بخەیت، ئەوا خاوەنەکەمان لە بەیانی زووتر نییە دەتبات دەتفرۆشێ.

گاکە هەر ئەوەندەی گوێی لە وشەی فرۆشتن بوو، زەندەقی چوو و وەکو گوێزی ساغ بۆی هەستایە سەرپێ و وتی:

- کورە بۆخاتری خوا شتی وانەڵێی!

- ئەمڕۆ خەڵکی گوندەکە هاتن سەرێکیان لە کێڵگەکەی ئێمە دا، ئیتر کە بینییان وا من لەبری تۆ خەریکی جووتم، هەواڵی تۆیان پرسی. خاوەنەکەشمان وتی کاکە باوەڕتان بێ ئەم گایە هەر لە ئەوەڵەوە تەمەڵ و تەوەزەل بوو، گەر وا بڕوات بێ سێ و دوو دەیفرۆشم بە قەسابەکە.

لەم نێوەندەشدا کەڵەشێرەکە کە لە شوێنێکی بەرزدا لێ دانیشتبوو و باڵەکانی فشکردبووەوە، بانگی کردە گاکە و ویستی شتێکی پێ بڵێت. ئیتر کاری خاوەنەکەشیان لەسەروبەندی تەواوبووندا بوو. بەڵام کە گوێی لە قسەکانی کەڵەشێرەکە بوو خۆی لە پشتی دەرگاکەوە شاردەوە گوێی بۆ قسەکانیان هەڵخست.

- ئەی گای هاوڕێم خاوەنەکەمان ناتفرۆشێت چونکە تۆ سبەی ئێوارە دەمریت. چی بکەین هەر ئەمەندەت لە چارە نووسرابوو. دواتر ڕۆیشتە لای سەگەکە و چپاندی بە گوێی ئەمیشدا و پێی وت مزگێنییەکی خۆشیم پێیە بۆت بەڵام دەبێت ئارام بگریت، هەر کە گاکە مرد تۆش بیکە بە ڕۆژی خۆت و تێر گۆشتی برژاو بخۆ.

خاوەن ماڵەکە زۆر دڵ خۆش بوو بە بیستنی ئەم قسانە. ئینجا هەردوو دەستی دەهێنا بەیەکدا و دەیوت بەڕاستی چاکم کرد خۆم فێری زمانی ئاژەڵان کرد، ئەگینا زیانێکی گەورەم لێدەکەوت.

هەر کە ڕۆژ بووەوە پیاوەکە گاکەی برد و لە بازاڕ فرۆشتی. بەم جۆرە لەم زیانەش ڕزگاری بوو. ئیتر دیسان تاوەکو ئێوارە زەوییەکەی بە گوێدرێژەکە کێڵا. کە هاتنەوە بۆ ماڵەوە لە باخچەکەدا گەیشتن بە کەڵەشێر و سەگەکە. جا کاتێك ئەم بارەکانی لە گوێدرێژەکە دادەگرت گوێی لێ بوو سەگەکە خۆی لە کەڵەشێرەکە توڕەکردووە و دەڵێت:

- تۆ درۆت لەگەڵ کردم. تۆ نەتوت بۆخۆت تێر گۆشت



دەخۆیت؟ ئەوە باشە دیسان خەریکە لە برساندا دەمرم. کەڵەشێرەکە باڵەکانی ڕاوەشاند و بە سەگی هاوڕێی وت:

- یەك دەنك خەمت نەبێت! کاکم گاکەی فرۆشت وای زانی قوتاری دەبێت. بەڵام سبەینێ کۆیلەکەی دەمرێت و لە خێری ئەو خواردن بۆ میوانەکان ئامادە دەکات و تۆش دەحەسێیتەوە و سکت تێر دەکەیت.

سەگەکەش بە ئاستەنگ لە جێگەکەی خۆی هەستایەوە و



تەماشایەکی خاوەنەکەی کرد کە خەریك بوو دەچووە گەوڕەکەوە و وتی:

- کوره ئەوە بەڕاستە؟ کەواتە بەقسەی تۆبێ سبەینی سکم تێر دەکەم؟

کەڵەشێرەکە وتی کاکە هیچ خەمت نەبێت و لێیدا و ڕۆیشت بەلای کاریەوە. سەگە برسیش لە ژێر درەختەکەدا خۆیدا بە زەویدا.

پیاوەکە هەر کە گوێی لەمانە بوو لەبەر خۆیەوە وردە پێکەنینێکی کرد و لەگەڵ یەکەم تیشکی خۆردا کۆیلەکەی برد بۆ بازاڕ و فرۆشتی.

ئەمجارەشیان توانی خۆی لە زیانی کۆیلە مردنەکەی ڕزگار بکات. بەڵام کە ئێوارە گەڕایەوە هەر خەیاڵی لای کەڵەشێرەکە بوو، ئاخۆ چ هەواڵێکی تازەی لێوە ببیستێ. سەگە برسیش بە درێژایی ئەو ڕۆژە هەرچی کوچە و کۆڵان بوو گەڕابوو شتێك ببینێتەوە سکی خۆی پێ تێر بکات. بەڵام بە چەند پارچەیەك نانی وشك برسێتییەکەی لانەچووبوو و سکی هەر قوڕەی دەهات.

سەگەکە خۆی گەیاندە لای کەڵشێرەکەو وتی:

- ئەوە تۆ دەزانی چەند ڕۆژە درۆم لەگەڵ دەکەیت و بەڵێنی خواردنم پێ دەدەیت، کەچی هیچیش دیار نییە!

کەڵەشێرەکە باڵی ڕاوەشاند و دەستی کرد بە خوێندن. کە لە قوقە قوق بووەوە بە سەگەکەی وت:

- من درۆ ناکەم. کاکەگیان گەر وتبێتم تێر نان دەخۆیت ئەوا دڵنیابە دەیخۆیت. خاوەنەکەمان بە فرۆشتنی گا و کۆیلەکەی لە زەرەر و زیان ڕزگاری بوو، بەڵام سبەینێ خۆی دەمرێت.

تۆ پەلەمەکە دەعوەتە گەورەکە سبەینێ یە. بە مەنجەڵی گەورە گەورە خواردن لێ دەنرێت. لێدە بۆخۆت ئەوەندە بخۆ تا مانگێکیش برسێتیت بەخەیاڵدا نەیەت.

کاکی خاوەن ماڵ بە بیستنی ئەم قسانە ئەژنۆی شکا. ئەو دوو جارەی پێشوو بە فرۆشتنی گا و کۆیلەکەی توانی خۆی ڕزگار بکات، بەڵام ئەمجارەیان چی لەدەست دەهات؟ بەهەناسە بڕکێ خۆی گەیاندە لای حەزرەتی موسا و بە پەژارەیەکی زۆرەوە هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و کەوتە تکاکردن لێی و وتی:

- تکات لێدەکەم یارمەتیم بدە! ڕزگارم بکە، ئەگینا دەمرم.

حەزرەتی موساش فەرمووی:

- ئەی لە سەرەتاوە پێم نەوتیت گوێ بە هەموو ئەو قسانە مەدە کە دەیانبیستیت؟ ئەگەر گاکەت نەفرۆشتایە ئەوا مردار دەبووەوە و بەوجۆرە بەڵایەکت لەسەر خۆت لادەدا. بەڵام تۆ واتزانی بەفرۆشتنی گا جووتەکە لە بەڵا ڕزگارت دەبێت. کەچی دواتر چویت کۆیلەکەشت فرۆشت و زەرەرت لە خەڵکی تریشدا. ئەمەیە ئاکام و دەرەنجامی ئەو کەسانەی تەنها لە بیری خۆیاندان و کەسی تریان بیرناکەوێتەوە.

# مار و لێبوردەیی

گۆران کیلۆیەك گۆشتی نەرمەی جوانی لێ کردەوە و دای بە کڕیارەکە و پارەکەشی خستە دەغیلەکەیەوە. دواتر تەماشەیەکی گوزەرەکەی کرد، بینی وا کوڕەکەی لەو ناوە نەماوە. بەرکۆشەکەی دانا و بە دیوارەکەدا هەڵی واسی. قرچەی نیوەڕۆ بوو، خۆر لە ناوڕاستی ئاسماندا بوو. شارۆچکەکە لە تاو گەرمای بەتینی خۆرەکە هەروەك مەنجەڵ دەکوڵا. ئینجا چووە بەردەم بەلۆعەی دوکانەکەیی و تا ئەم دەم و چاوی شۆرد و خۆی فێنك کردەوە، کوڕەکەشی هاتەوە. پاشان دوکانەکەی بەسەردا جێهێشت و خۆی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.

ماڵەکەیان زۆر دوور نەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی کەمێك زووتر بگاتەوە ماڵەوە، بڕیاریدا لە قەدبڕەکەوە بگەڕێتەوە. ئیتر خۆی کرد بە توولە ڕێگاکەدا و گەیشتە سەرقەبرانەکەی لای ماڵی خۆیان. لەوێ لە ژێر سێبەری چنارێکی زۆر گەورەدا کە لق و پۆپەکانی ئەو ناوەیان داگیرکردبوو، دانیشت و دەستی بەرزکردەوە و فاتیحەیەکی بۆ مردووەکانی گۆڕستانەکە نارد.

فاتیحەکەی خوێند و ویستی هەستێت، کەچی کەمێك لەولایەوە مارێك کە لەسەر بەردێك درێژ ببوو سەرنجی وەستا گۆرانی ڕاکێشا. ئەویش بە ترس و لەرزێکەوە یەك دوو هەنگاو کشایە دواوە.

مارەی داماو تەنانەت حەوسەڵەی ئەوەشی نەبوو لە جێی خۆی بجوڵێتەوە و لە ژێر گەرمای ئەو خۆرەدا دەمی بۆ چۆرە ئاوێك داچەقاندبوو و خەریك بوو لە تینوێتیدا دەخنکا.

وەستا گۆرانی قەساب کە زانی مارەکە تینویەتی و فسکە

فسکی ئاویەتی، کون بە کونی ئەو ناوە بەدوای جامێك ئاودا گەڕا.

دوای ئەو هەموو گەڕانە یەك چۆڕە ئاو چییە دەستی نەکەوت. لەکوێوە هاتبوو هەر لەوێشەوە گەڕایەوە. هەر کە گەیشتە لای چاخانەکەی مام بارام، خێرا جامێك ئاوی پڕکرد و لەگەڵ خۆی بردی. ئەوەندە پەلەی بوو زوو بگاتە مارەکە و ئاوی بداتێ، چین چین ئارەق بە ناوچەوانیدا دەهاتە خوارەوە و گوێشی نەدەدایە. مارەکە نەیتوانیبوو یەك بست لە شوێنی خۆی بجولێ. وەستا گۆرانیش جامە ئاوەکەی خستە بەردەمی و مارەش بە هەزار حاڵ ملی شۆڕکردەوە بۆ ناو جامە ئاوەکە و ئەوەندەی خواردەوە تا تینوێتی شکا. کە مارەکە ئاوەکەی دەخواردەوە وەستا گۆران هەناسەیەکی هەڵکێشا و دڵخۆش بوو بەوەی لە ڕۆژێکی ئاوا گەرمدا توانیویەتی یارمەتی بەستەزمانیك بدات. ئیتر بێ ئەوەی مارەکە زیاتر بێزار بکات، ملی ڕێگەی گرتەبەر و ڕۆیشت. بەڵام یەك دوو جار هەر ئاوڕی دایەوە بۆ مارەکە و دیاربوو تۆزێك هێزی بەبەردا هاتبووەوە و بە ڕووانینەکانی دەستخۆشی لە وەستا گۆران دەکرد.

ئیتر پاش ئەوەی نانی نیوەڕۆی خوارد و کەمێك پاڵی دایەوە، بڕیاریدا لە هەمان ئەو ڕێیەوە بگەڕێتەوە بۆ سەرکارەکەی کە مارەکەی لێ بینیبوو. وەستا گۆران هەنگاوەکانی خێراتر کرد. کە گەیشتە ئەوێ بینی وا مارەکە لە ژێر سێبەری دار چنارە قەشەنگەکەدا وەستاوە و چاوەڕێی ئەم دەکات.

- ئای خوایە گیان ئەوە من چی دەبینم؟

مارەکە چووە سەر تاشە بەردێك و ئەو پارچە ئاڵتونەی بە دەمییەوە گرتبوو لەبەردەم وەستا گۆراندا داینا.

وەستا گۆرانی قەساب باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەکرد، ئاڵتونەکەی هەڵگرت و سەیرێکی کرد تا بزانێت ڕاستەقینەیە یاخود نا. بەڵێ خۆی بوو، ئاڵتوون دەرچوو. ئیتر دەستی بەرزکردەوە و وتی: "خوایە گیان زۆر سوپاست دەکەم. بەم پارچە ئاڵتونە هەموو قەرزەکانم دەدەمەوە. زۆر سوپاس بۆ تۆش ماری هاوڕێم." پاشان گەڕایەوە بۆ دوکانەکەی.

ڕۆژی دواتر گۆران بە دەنگی بانگی بەیانی بەخەبەر هات. هێشتا دنیا تاریك بوو. بەڵام شنەبای بەیانییان گەڵای درەختەکانی بەهێواشی دەلەراندەوە و فێنکییەکیشی بەو ناوە بەخشی بوو. پاش نوێژ جامێك شیری پڕ کرد و بە کوڕەکەی وت:

- ڕۆڵە گیان ئەوە من ڕۆیشتم، تۆش درەنگ مەکەوە، کە هاتیت کاوڕەکە لەگەڵ خۆتدا بهێنیت، بیرت نەچێت.

کاتێك گۆران بە ڕێگادا دەڕۆیشت بیری لەوە دەکردەوە دەیوت تۆ بڵێیت جارێکی تر مارەکە ببینمەوە. چونکە ببوون بە هاوڕێی یەك و دەیوست درێژە بەم دۆستایەتییەیان بدات.

لەو کاتەدا کە خۆر لە نێوان گەڵای دار چنارەکانەوە خۆی نمایش دەکرد، شارۆچکەکە بە تەواوەتی ڕووناك بووەوە و گۆرانیش گەیشتە بەردەم دار چنارەکە. تەماشایەکی سەر بەردەکەی کرد بینی وا مارەکە لەوێیە. ئەمیش بە بینینی زۆر دڵخۆش بوو. شیرەکەی بۆ جێهێشت و چووە سەر کارەکەی. دیسان لای نیوەڕۆوە کە دنیا گەرمی کرد خۆی کۆکردەوە و بە پەلە بەرەو ڕێی گۆڕستانەکە کەوتە ڕێ. هەر کە گەیشتە بەردەم دار چنارەکە بینی وا مارەکە چاوەڕێی دەکات و پارچە ئاڵتونێکیشی بەدەمەوەیە.

بەبینی ئەمە خەریك بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێت. مارەکە

ئاوەکەی خواردەوە و کاکی قەسابیش پارچە ئاڵتونی خۆی وەرگرت و ڕۆیشتەوە بۆماڵەوە.

لەو ڕۆژە بەدواوە دۆستایەتییەکەیان بەردەوام بوو. ئیتر ئەوەندەی نەبرد وەستا گۆرانی قەساب بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندە دیارەکانی شارۆچکەکە. کاتێك وەرزی حەج هاتە پێشەوە بڕیاریدا بچێت بۆ بە جێهانانی فەریزەی حەج. ئیتر لەسەروبەندی ڕۆیشتنیدا کوڕەکەی بانگکرد و هەموو بەسەرهاتەکەی نێوان خۆی و مارەکەی بۆ گێڕایەوە.

لەکۆتایی قسەکانیشیدا پێی وت:

- کوڕی شیرینم بەیانیان شیرەکەی بۆ دابنێ و نیوەڕوانیش ئاڵتونەکەی لێوەرگرە. بەڵام زۆر وریای خۆت بە.

لەپاش ڕۆشتنی گۆران بۆ حەج، کوڕەکەشی وەك باوکی بەردەوام بوو لە شیر بردن بۆ مارەکە. بەڵام ڕۆژێکیان لەم کارە زۆر ماندوو بوو و وتی: "وا باشترە لەبری ئەوەی هەموو ڕۆژێك شیری بۆ بهێنم، بچم دوای بکەوم بزانم ئەم ئاڵتونانە لە کوێ دەهێنێت، منیش دەچم هەمووی دەبەم و لەم ماندووبوونەش ڕزگارم دەبێت."

بۆ ڕۆژی دواتر کوڕە شیرەکەی دانا و لە پشتی درەختەکانەوە خۆی حەشاردا. مارەکەش شیرەکەی خواردەوە و خۆی کردەوە بەناو تاشە بەردەکاندا و پاش کەمێك پارچە ئاڵتونێکی لەگەڵ خۆی هێنا و گەڕایەوە. یەکسەر کوڕەکەی وەستا گۆرانیش بە تەور کەوتە سەروێزەی مارەی داماو. مارەکە نەیدەزانی ئەم کوڕە بۆ وا دەکات. خێرا خۆی کرد بەناو کونەکەیدا بەڵام تەورەکە بەر کلکی کەوت و قرتاندی. داماوە لەتاو ئازاری کلکی هاتەوە دەرەوە و دای بە کوڕەکەوە و ژەهراوی کرد.

کوڕەکەش لەتاو گیانی خۆی هەتا ماڵەوە بەپێی پەتی ڕایکرد. بەڵام بەرگەی نەگرت و لە نیوەی ڕێگادا بورایەوە. خەڵکی ئەو گوزەرە کە بینیان وا کوڕەکەی وەستا گۆران بوراوەتەوە، خێرا هاتن بەدەمیەوە و فریای کەوتن.

حاجی گۆران کاتێك لە حەج گەڕایەوە و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە زۆر دڵگران بوو. بەیانییەکیان زوو چووە ژێر دار چنارەکە و پاش کەمێك مارەکە لە کونەکەی هاتە دەرەوە. حاجی گۆران هەتا بڵێی شەرمەزار و دڵتەنگ بوو. بۆیە بە مارەکەی وت:

- لە کەم و کورتیمان ببوورە خەتای کوڕەکەی من بوو. باوەڕبکە ئاگاداریشم کردبووەوە وریای خۆی بێت و ئازارت نەدات. بەڵام با دۆستایییەکەی نێوانمان بەوە تێکنەچێت. من بەردەوام دەبم لە شیر هێنان و تۆش ئاڵتونم بۆ بهێنە.

مارەکە بە کلکی قرتاوەوە هاتە سەر تاشەبەردەکە و بە حاجی گۆرانی وت:

- داواکارم خوای گەورە حەجی تۆ و سەرجەم حاجییانی قبوڵ کردبێت. نابێت قین لەدڵی و هەڵەی کەسێکی نەزان ببێتە هۆی لەبیرکردنی ئەو هەموو دۆستایەتییەی نێوانمان. خوا شیفای کوڕەکەی تۆش بدات و کەسێکی سەرکەوتووی لێدەرچێت و ئاگاداری کەرەوە کە جارێکی تر ئازاری گیانداران نەدات.




لە ژیانی هەر یەکێکماندا چەندین چیرۆکی بەپێز و پەندئامێز هەن کە کاریگەرییان لەسەر ژیانمان داناوە. ئەم کتێبەی بەردەستان گوڵچنێکی چەندین کورتە چیرۆکی ناوازە و پڕواتایە.

چەپکێک لە چیرۆکەکان: ئەو مێرووولەیەی لە ناو گوێنییەکەدا بوو، ئەو گەنجەی لە پێناو دایک و باوک و منداڵەکانیدا کاری دەکرد، ئەو پاشایەی بەدوای دڵخۆشیدا دەگەڕا، ئەو پیاوەی دەیویست فێری زمانی ئاژەڵەکان بێت، قسەی نابەجێ، هەژار و دەوڵەمەند، دووپشک و چەندین کورتە چیرۆکی تر.



9 649750 000222
www.irfanpublishing.com
Kıssalardan Dersler - 1





نرخی ٣٠٠٠ دینارە